# پێشەکی

زۆر دەمێك بوو حەزم ئەکرد کە کتێبێك بە زمانی کــــــــــوردی سەبارەت بە خەباتی گەلی ڤێتنام بنا خنمــە ناو کتێبخانەی کــوردی‌یەوە ، ئەوەبوو کتێبێکم بە زمانی عەرەبی بە ناوی (قصة کفاح شعب فیتنــام) دەسکەوت کە لە چاپخانەی (دار المعارف)ی میسری لە ساڵی ١٩٧٠ لـــە چاپ دراوە ،وە توانیم بە پێی توانای خۆم پاش هەندێك دەسکاری ئەم کتێبە وەرگێرمە سەر زمانی کـــــوردی ٠

پێش ئەوەی بێمە سەر ناوەرۆکی کتێبەکە چەند خاڵێك هەیە بە پێویستی ئەزانم بیان خەمە ڕوو :ـ

١ ـ لە کاتێکا ئەم کتێبە لەچاپ دراوە هێشتا گەلی ڤێتنامی خواروو بەردەوام بوو لەسەر خەبات دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکا ،بەڵام ئێستـــــا کەلە ساڵەکانی هەشتاداین دەبینین ڤێتنامی خواروو سەربەخۆیەو لەگەڵ ڤێتنامی باکوور یەکیان گرتۆتەوە ٠ نووسەری کتێبەکە تەنهـــــا باسی رزگاربوونی ڤێتنامی باکووری کردووەو پاشان کورتەیەکی لە خەباتــی ڤێتنامی باشوور خستۆتە ڕوو ٠ بەڵام من لێرەدا پاشکۆیەکم خستۆتــە سەر کتێبەکە کە بە درێژی لە خەباتی ڤێتنامی خواروو دەدوێ لەگـــەڵ چۆنیەتی یەکگرتنەوەی لەگەڵ ڤێتنامی باکـــــوور ٠

٢ ـ هەر دوابەدوای پاشکۆکە چەند بابەتێکی مێژوویی وئەدەبیــم خستووەتە ســــەر کتێبەکــــە ٠

٣ ـ ژمارەیەکی زۆر زاراوەو ناوو ووشەم ڕوون کردۆتەوە ،چونکە وابزانم بەبوونی ئەم ڕوون کردەوەیە خوێنەر ئاسانتر لە کتێبەکـــــە تێ ئەگـــــات ٠

ناوەرۆکی کتێبەکەلە سەرەتادا دێتە سەر باری ئابووریو جوگرافی ڤێتنام ٠بێ گومان بوونی ئەم بابەتە بە پێویست ئەزانم چونکە جـــۆری ناوچەکە کار لە تەکتیکەکانی شۆرش ئەکـــــات ٠

دوای ئەوە دێتە سەر مێژووی ڤێتنام کە ئەمەش دەکرێ بـــە دوو بەشەوە : پێش هاتنی ئیمپریالیزمی ئەوروپا ، ڤێتنـــــام پاش هاتنـــی ئیمپریالیزمی ئەورووپـــــا ٠

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە بابەتی باری جوگرافیو ئابووری لەگەڵ بابەتی ڤێتنام پێش هاتنی ئیمپریالیزم کورتم کردۆتەوە ،وە ئەوەی پێویستی بە باس کردن هەبووە خستوومەتە ڕوو ٠

ئەم کتێبە لە مێژووی خەباتی گەلی ڤێتنام دەدوێ ،ئەو گەلـــــەی بەدرێژایی چەرخەکانی مێژوو دژی ئیمپراتۆریەتی چینو دژی دەسەڵاتـی دەرەبەگی ،پاشان دژی ئیمپریالیزم خەباتی کردووە ،وە هەرگیـــــــــز مل کەچی ئەم چەوسێنەرانە نەبووەو سەری بۆ شۆر نەکردوون ،بەلکـــو قوربانی داوەو لاوەکانیان لەم ڕێگەیەدا خۆیان بەخت کردووە ٠ هیـــچ رۆژێك داوای ئاشتی بێ ئازادییان نەکردووە ، ٠

گەلی ڤێتنام ئەو گەلەیە کە خاوەنی داستانە نـەبەردییەکـــەی (دیان بیان فۆ)یە کە تیایدا لووتی ئیمپریالیزمی فەرەنسی بۆ هەتاهەتـا لە ڤێتنامدا شـــــکا ٠

کونجو کەلەبەری ئەم گێتییە نیە یەچاوی خۆیان لە ڕێگـــــەی فلیمەکانەوە قارەما نیەتی خەباتگێرانی ڤێتنامیان نەبینیبێ کە چـــــون

ئەمریکاییەکان سەرشۆردەکەن و دەیان بەزێنن ،وە تۆڵەی هەمـــــــوو گەلانی تریان لێدەکەنەوە ۰

گەورەو بچووکی ئەم زەمینە نەماوە ناوی هۆشیمنەی نەبیستبێ ، ئەو رابەرەی لە دوو شەڕی گەورەدا سەرۆکایەتی گەلی ڤێتنامی کـــــرد دژی ئەوانەی بە ئاگرو ئاسن لەگەڵ گەلانی جیهاندا دەجوولێنەوە ۰ بـــەو شەڕەی لەگەڵ گورگە برسییەکانی واشنتۆن کردیان سەلمـانديــــــان کە هێزی ماددی بەرامبەر مرۆڤ سنورێکی هەیە ۰

گەلی ڤێتنام لە هەموو کـــاتو شوێنێکـــدا دروشمی (خـــەبات تــــا سەرکەوتن) یان هەڵگرتووەو هەرگیز لە قوربانیدان سڵیان نەکردۆتەوە ۰ بوێنەرانی بەرەی رزگاریخواز هەموو کاتێك ئەوەیان دووبارە دەکردەوە کاتێ دەیـــان ووت :

(تا سەرکەوتن لە تێکۆشان ناوەستین ،ئەم شەڕەی بەسەرمانـــدا سەپێنراوە دەبێت هەر کۆتایی بێت ،بەسەرکەوتن یان بە تێکشکــــــان ،بەڵام دوژمن دەبێ بزانێت ئەگەر دەیەوێ سەربکەوێت ،ئەوا دەبێت لە سەرەتادا نەتەوەکەمان قەلاچۆ بکات ۰هەر یەکێك لە ئێمەدا مـــــــردن بەباشتر دەزانێت لە ژیانێکی دوور لە ئازادیو سەربەخۆیی کاتێــــك گوێمان لەم ووتانە دەبێت دوورنیە بـــە پـــروپاگـــەندەیەکـــی بــــــەرەی رزگاریخوازی دابنەین ،بەڵام رووداوەکانی رۆژانەی شۆرش بەتایبەتـــی هێرشە بەجەرگانەکەی شۆرشگێران لە ساڵی ۱۹٦۸ کە کەمتر لـــــــــە هەفتەیەکی خایاند ،تیایا زیاتر لە ۲۸ هەزار خـــەباتگێـــر کـــوژران ،بریندارێش لە ژمارە نەئەهات ۰ئا ئەم کارەساتەجەرگبڕەو دەیەهـــای تر نەیان توانی وورە بە گەل بەربدەن ،بەڵکو هەر سووربوون لەســــەر دروشمەکەیان ۰

لەو شەڕەی ووڵاتە یەکگرتووەکان بەسەر ڤێتنامی‌دا سەپاند ، ئەمریکا زیاتر لە ٤٥٠٠ فڕۆکەی ناردە سەر خاکی ڤێتنام کە بەردەوام شـــارو گوندەکانیان دەکوتا ، بە تەن ئاسن‌و بۆمبای ژەهراوی‌یان فـــــــڕێ دەدا بە خوارەوە ، ئاگریان لە کێڵگەو دارستان‌و خانووەکان بەرئـــەدا

ئائەم هێزە گەورەیەی ئەمریکا کە نوێنەری شەڕە لە جیهانـــدا نەیتوانی کۆڵ بەگەلی ڤێتنام بدات ٠هەر ئەم گەلە بوو توانی هەیبەتـــی ئەو ئەمریکایە بشکێنێ کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌و تەنانەت جیهانیش وەکو ئەفسانەیەك باسی هێزی سەربازی‌و چەك‌و ئازووقەی دەکەن ٠

دوای تێکشکانەکەی ئەمریکا لە ڤێتنام ،ئەمریکا هیچ دەرسێکـــی لەم هەرەس هێنانەی وەرنەگرت‌و لەسەر ڕێرەوە چەپەڵەکەی خــــۆی هەر بەردەوام بوو ،هەروەك کورد ئەڵێ (تۆبەی گورگ مەرگە) ٠

نیکاراگوا باشترین بەڵگەی قسەکانمانن ، کاتێك شۆڕشگێـــڕان تەنگیان بە حوکمرانەکان هەڵچنیبوو ، ئەمریکا هـــەوڵێکـــی بێ‌پایانـــی‌دا بۆ ئەوەی کورسی‌یەکەی ڕژێمی سۆمۆزا لە ڕووخان بپارێزێ ، بەڵام گەلی نیکاراگوا بە خۆپیشاندان‌و لە ڕێگەی لوولەی تفەنگەکانیانەوە تـەخت‌و تاراجی ئەم حوکمە بۆگەنە بەکرێ‌گیراوەیان تێك‌وپێك‌دا ٠

ئێستاش کە لەساڵی١٩٨٣دا ین پاش تێکشکانە یەك‌لەدوای‌یەکەکانی لە ڤێتنام‌و ئەنگۆلاو٠ نیکاراگوا ٠٠٠٠ هتد دەیـەوێت فریـای ڕژێمـــی سلفادۆر بکەوێ نەیەڵێ هەمان چارەنووسی ڕژێمە کۆنەپەرستەکانـــی پێشوویان هەبێ ٠هەر بۆ ئەم مەبەستـەش چەندەها پسپۆڕی سەربازی و چەك‌و ئازووقە بۆ ئەم ڕژێمە ڕەوان دەکـات ،تەنانـەت سەربازیشـــی بۆ دەنێرێ نەوەك ئەم ڕژێمەشی لەدەست بچێ‌و لە ئەمریکـــــای لاتین دەست بەتاڵ بمێنێتەوە ٠

## ئایا مێژوو دووبارە ئەبێتەوە ؟

تا شەڕی دووەمی جیهانیش کۆتایی هات ،گەلانی ئازادیخواز هیچ رەخنەیەکیان لە وولاتە یەکگرتووەکان نەئەگرت ،تەنانەت بە هەڵگری مەشخەڵی ئازادیو سەربەخۆیی گەلان دەدرایە قەڵەم • بەڵام دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٧ لەگەڵ زایۆنیستەکان دەستی تێکەڵاو کردو بەشداری داگیرکردنی خاکی عەرەبی کرد ،وە دوای دەست تێوەردانەکەی لە ڤێتنام ، هەروەها دوای هەوڵدانەکانی بۆ لە باربردنی هەموو بزوتنەوەیەکی سەربەخۆیی گەلان ،ڕای گەلانی جیهان بەرامبەری گۆڕاو خرابە ریزی وولاتە ئیمپریالیستو داگیرکەرەکانەوە •

بەڵێ زۆرجار مێژوو لە شێوە روخسارو مەبەستی تردا دووبارە ئەبێتەوە هەمووی دەساڵێك بەسەر تێکشکانەکەی ئەمریکا لە ڤێتنام تێپەڕ نەبوو ،یەکێتی سۆڤیەت دەستی خستە کاروباری ناوخۆی گەلی ئەفغانستانەوە ،سوپایەکی بێشوماری هاویشتە ناو خاکی ئەفغانستانەوە ،سەدان بنکەی سەربازی رووسی تیا دامەزراند • بەڵام ئەمیان لە ژێر مەبەستو ویستێکی جیاواز لەوەی ئەمریکا ،گوایە دەیانەوێ رژێمێکی کۆمۆنیستی بەدیاری بۆ گەلی ئەفغانستان بەرن •

با گشت گەلانی جیهان ئەوە چاك بزانن کە یەکێك لە یاسا هەرە گرنگەکانی دەوڵەتە گەورەکان لە هەموو کاتو شوێنێکدا ئارەزووکردنە بۆ دەست بەسەراگرتنو دەست خستنە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتو گەلە بچووکەکان •

جگە لەمەی کە ووتمان یەکێتی سۆڤیەت بە پارەو چەکو تفاقـــی سەربازی دەستگیرۆیی رژێمی ئەسیوبیا ئەکـات تا بلێسەی شۆرشـی گەلی ئەرتریای پێبکوژێنێتەوە ،فرۆکە دەنێرنە سەر شۆرشگێـــرانو شەهیدیان دەکەن. هەموو ئەم کارانە دەکات تەنها لەبەرئەوەی رژێمەکەی مەنگیستۆ رژێمێکی کۆمۆنیستیـیـــە .

٢٠ـ٧ـ١٩٨٣ کەرکوك

فەرهاد هەمزە محەمەد قوتابی نـــە

زانکـۆی سەلاحەریـن کۆلیجی زانستەکـان

# شانۆی ژیـــان

پێش ئەوەی بێینە سەر باسی مێژووی گەلی ڤێتنام کە پـــــڕە لە گەلێك ڕووداوو گۆڕینکاری شارستانیو ڕامیـــاری ،پێویستە لـــــە سەرمان ئەو زەوییـــە بناسین کـــە ئـــەم میللەتەی لـــە سەر ئەژێـــن ،ئەو بارە ئابووریيە جیاوازەی کە کاریگـــی گەورەی کـــردۆتە ســـەر پێکهاتنی گەلو کۆکردنەوەیانو پەرەسەندنی مێژوویـــی وشارستانـــی ڕامیـــــاری ٠

## باری جوگرافیو ئاووهەوا :

ڤێتنام ئەکەوێتە بەشی ڕۆژهەلآتی نیمچە دورگەی هیندی چینـــی کە ئەویش دەکەوێتە خوارووی ڕۆژهەلآتی ئاسیا ٠

سنوورەکەی لە بەشی باکوورەوە چینی میللیيە ،لە ڕۆژئاواوەش لەگەل لاوسو کەمبۆدیا هاوسنوورە ،لە باشووریشەوە نیمچە دورگــــەی (مەلایۆ)یە ،بەلآم لایە ئاوییەکەی دوورگـــەی (تایوان) یـــان (فرمـــۆزا) دەوری داوە ٠

ئەگەر چاوێکی گشتی بە نیمچە دوورگەی هیندی چینیدا بگێڕین دەبینین دووی خاکەکەی لە زنجیرە چیای (ئەنام) پێكهاتووە کـــــە لە باکوورەوە بۆ باشوور کشـــــاوە ٠

ڕووباری (میکۆنگ) کە درێژییەکەی ٢٧٠٠ کـم دەبێت ،لـــــە بەرزاییيەکانی (تبت)ی ناوەراستی ئاسیاوە هەلدەقوولێو بە ڕۆژئاوای زنجیرە چیاکانی ئەمدا تێپەر دەبێت ٠

له باکووری ڤێتنامیشەوە بەرزاییەکانی (یانان) دەبینری کـــــە
رووباری سوور (سۆنگ هۆنگ)و دوو لقە سەرەکییەکەی ،رووبـــاری
رەش (سۆنگدا)و رووباری روون (سۆنگلۆ)ی تێدا هـەڵدەقوولێت٠
درێژی رووباری سوور دەگاتە ١٢٠٠ کم ،بەڵام تەنها ٥٠٨ کم ی بـــــە
زەویوزاری ڤێتنامدا تێپەر دەبێت ٠ئـەم سێ رووبارە لە نزیك شـــاری
(هانۆی)دا دەلتایەکی بە پیت دروست دەکەن کە بە دەلتای (تۆنکیـــــن)
ناسەراوە ٠جگە لەم رووبارانە رووباری وەك (سۆنگما، سۆنگکـا)
ش لە ڤێتنامدا هـــــەیە ٠

بەڵام ئەگەر بێتوو بڕوانینە چیاکانی ڤێتنام دەبینین بـــە زۆری
کەوتوونەتە باکوورەوە وەك بەرزاییەکانی باکووری رۆژهەڵات کە بـە
(فیتباك) ناسراوەو بەرزاییەکەی لە نێوان ١٠٠٠ــ٢٠٠٠م لە ئاستــی
رووی دەریاوە دەبێت ٠

بەڵام لە زنجیرە چیاکانی باکووری رۆژئاوا کە بە (تایباك) ناسراوە
بەرزترین لوتکە لوتکەی (ڤانسیبان)ە کە بەرزییەکەی خۆی لە ٣١٤٠م
ئاستی رووی دەریاوە دەدات ٠

لە گرنگترین دەشتەکانی ڤێتنام دەشتی (تۆنکین)ە ،کە لـــــەو
نیشتەیە پێکهاتووە کە رووباری سوورو چەند لقێکی پێوەلکاوی هەڵیان
کرتووە ، هەروەها دەشتی (کۆشینچین) لە نیشتەی رووباری (میکۆنگ)
دروست بـــــووە ٠
لە بارەی ئاووهەواشەوە ،ناوچەکانی باکوور لە زستاندا ساردە ،وە لە
هاوینا گەرمە ،ناوچەکانی باشووریش بەهۆی نزیکییەوە لـــە هێڵـــــی
یەکسان بە درێژایی ساڵ گەرمە ٠ ناوچەکە بە گشتی هــــەوای وەرزی

هاوین لە ئۆقیانووسەوە هەڵدەکاتە سەری و دەبێتە هۆی باران باریـــن لە هاویندا ٠ جگە لەمە هـەوای وەرزی زستانەش لــە چینەوە ڕووی تێدەکات و دەبێتە هۆی باران بارین لە زستاندا ٠

## باری ئابـــووری

لە شوێنێکی وەك ڤێتنام کە خاوەنی ئاووهەوای وەرزی بێت و ڕووی زەوی یەکەشی لە دەشت و بان و چیـا پێكهـاتبێ ،دەبینین ژیانـــــی دانیشتوانیشی جیاواز دەبێت ٠

لە دەشتی تۆنکین و کۆشین چین و بە درێژایی دەشتە کەنارییەکان کە خاکێکی بە پیتیان هەیە ،دانیشتوان بە شێوەیەکی چڕ تیایـــدا کۆبوونەتەوە و بە کـاری کشتوکاڵـی هەڵدەسن کـــە برنج بەرهەمـی سەرەکییانە ٠جوتیاران جگە لە برنج بەرووبوومی تریش لە ناوچـــە دەشتەکاندا دەچێنن وەکو مۆز و بیبەر و هەندێ بەهارات لە باشـــووردا کە ئاووهەوایەکی گەرمی هەیە ،هەروەها سەوزە لە باکووردا کـــــە خاوەنی ئاووهەوایەکی مام ناوەندیە ٠شان بەشانی ئەمانە بەرووبوومـی تری وەك پەتاتە کە لە وولاتانی ئەمریکا و ئەوروپـاوە هێنراوە بـــە شێوەیەکی کەم دەچێنرێ٠ چاش لە چیاکانی ئەنامدا دەبینرێ کە بەشی ناوخۆی ڤێتنام دەکات و ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ دەرەوەی دەنێرن ٠

جگە لە کشتوکاڵی دانیشتوانی ڤێتنام مەڕ و ماڵاتیش لە ناوچـە دەشتەکانداو ئەو ناوچە شاخاوییانەی کە گژوگیای تیا دەڕوێ بـــە خێودەکــــەن ٠

ئەگەر بێتوو ئاورێك لە كانگای زەوی ڤێتنام بدەینەوە بۆمـــان دەردەكەوێت كە زۆر دەوڵەمەندە ،بۆ نموونە خەڵووز لە كانە فراوانەكانی ناوچەی (هۆنجای) نزیك شاری (هایفۆنگ) لە باكووری ڤێتنامدا هەیە ،هەروەها قەصدیرو توتیاو قورقۆشم لە شیوی رووباری ڕوون لـــە باكووری رۆژهەڵاتدا هەیە ٠نشتووەكانی مسیش لە هەڵەتەكانـــــی باكووری رۆژئاوادا دەبینرێ ٠جگە لە مانە زۆر بەرووبوومی كانزایـــی تریش هەیە كە سوودی لێوەرنەگیراوە وەك پلاتینو فۆسفات و زێـــر ٠٠٠هتد ٠لە رووی پیشەسازی قورسیشەوە پیشەسازی ئاسن لـــە شاری (تاینجوین) هەیە ،هەروەها پیشەسازی جیـاواز لـــە شارە سەرەكی‌یەكانی تۆنكین لە باكووری ڤێتنامدا هەیە ٠ ســەرەرای گشت ئەمانە پیشەسازی ســابوونو شووشــەو گــەلێك شتی تریشـ سەری هەڵـــداوە ٠

# ڤێتنام لە پێش هاتنی ئیمپریالیزمدا

## دروست بوونی گەلی ڤێتنـــام

شوێنی جوگـرافی نیمچە دورگـــەی هیندی چینـــی وبــــاری جوگرافی‌یەکەی کارێکی گـەورەی کـردۆتە ســـەر دروست‌بوونـــــی دانیشتوانی‌و رووداوەکان کە بە درێژایی چەرخەکانی مێژوو ڕوویداوە ۰لە بەر شوێنە جوگرافی‌یەکەی ببووە یەکێك لە داهێڵەکانی کۆچـــــی مەنگۆلی‌یە کۆنەکان ،ئەم کۆچ‌کردنانەش لە وولاتی بــاووباپیرانـــەوە دەستی پێ‌کرد کە باکووری چیای هیمالایایە ۰وەنەبێت ڕەگەزی مەنگۆلی تاکە ڕەگەز بێت کە کاری لە درووست‌بوونی دانیشتوانی هیندی چینیدا کردبێ ،بەڵکو ڕەگەزەکانی (خامیر) ۰ کە خاوەنی ڕۆشبنیری‌یەکـــــی هیندی بوون توانیان کاری سیاسی‌و رۆشنبیری‌و بازرگانی بکەنە سەر بەشەکانی باشووری هیندی‌چینی ۰دیسان لەو ڕەگەزە گرنگانـــــەی کە دانیشتوانی هیندی چینی پێك‌دێنن رەگەزی (شامپا)یە کە بنەڕەنیان بە تەواوی نەزانراوە ۰بەم جۆرەو بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین هیندی چینی دوو ڕەگەزی سەرەکی تێدا نیشتەجێ بووە :ـ

١ـ ئەنامی‌یەکان کە دەگەرێنەوە بۆ ڕەگەزی مەنگۆلی باکووری کە لە چەند قۆناغێکی مێژوودا رۆشنبیری چینی کاری تێ‌یان کردووە ۰

٢ ـ کەمبۆدی‌یەکان کە رەگەزی مەنگۆلی باشوور دەنوێنن ،ئەمانـە رۆشبنیری هیندی کاری لێ کردوون ۰

سەرەرای ئەم دوو ڕەگەزە چەند ڕەگەزێکـــی تریش هەیە بەلام بـــــە ڕێژەیەکی کـــــەمتر ۰

کەواتە گەلی ڤێتنام لە ڕەگەزی (ڤیت) یان (ئەنام) پێکهاتـــووە کە ڕێژەیان دەگاتە ٨٧٪ ،بەڵام ڕەگەزەکانی تر ڕێژەیان کەمترەو بـــە ژمارە خۆیان لە ٤ملیۆن کەس دەدەن ٠

## بەرەبەیانی شارستانیەتی ئەنـــام

پێش ئەوەی بچینە ناو مێژووی گەلی ڤێتنام لـە پێش هاتنـــــی ئیمپریالیزمدا پێویستە کاری ئەو شارستانی‌یە بێگانانە لە ســـــەر ئەم گـەلە ڕوون بکەینەوە کـە هۆیەکەی دەگـــەڕێتەوە بۆ شوێنـــە جوگرافی‌یەکەی ،هەروەها دەبێت ئەوە بزانرێ کە چۆن گەلی ڤێتنـــام توانی سوود لەو شارستانی‌یە بێگانانە وەربگرێو شارستانیەکی نـوێی لێ دروستبکـــــات ٠

ووشەی هیندی چینی بەسەر ئەو نیمچە دورگەیەدا دابڕاوە کـە ڤێتنام بەشی ڕۆژهەڵاتی پێکدێنێت ٠ ئەمەش ڕاستی‌یەکمان بـــــۆ ڕوون دەکاتەوە کە شوێنی ئەم وولاتەیە لە نێوان دوو جیهانی گەورەدا کە هەریەکەیان خاوەنی ڕۆشنبیری‌و شارستانی تایبەتی خۆیانن ،جیهانی هیندی لە ڕۆژئاواو باشووری ڕۆژئاواوە ،جیهانی چینیش لە باکوورەوە ،کە هەریەکەیان کاریان لە ڕۆشنبیری‌و پەرەسەندنی مێژوویی گەلـــی ڤێتنام کردووە ٠ وەنەبێت شارستانی‌و ڕۆشنبیری ڤێتنامی تەنهـــــا لەم جیانەوە پێکهاتبێ ، بەڵکو توانیویەتی لە ئەنجامی تێکەڵاوبـــوون داگیر کردن‌و بازرگانی سوود لە هەندێك لایەنی وەربگرێو لەگـــــەڵ شارستانیەتی خۆیدا لە قالبێکی نوێدا دایبڕێژێت کـە بەدرێژایـــی چەرخەکانی مێژووی کۆن‌و ناوەڕاست‌و نوێ بەرگری لێ دەکـــــردو دەیپاراست ڤێتنامی‌یە کۆنە بنەڕەتەکان (ڤیت یان ئەنامی) لە بەرەبەیانی

مێژووی مرۆڤایەتی‌یەوە توانیویانە شارستانی‌یەك بنیان بنێن ،باشترین بەڵگە بۆ قسەکانمان ئەو دۆزینەوانەیە کە زاناکان لە ناوچەکانی ڤێتنامدا دۆزیویانەتەوە ٠

لە شانشینە کۆنەکان شانشینی (ئۆلاك) کە شاری (کولوا) پایتەختی بوو بە نموونە ئەهێنینەوە ٠پاشاکانی ئۆلاك بەرهەڵستی‌یەکی زۆری حوکمڕانە چینی‌یەکانیان دەکرد ،تا ساڵی ١٧٩ پ٠ز کە ئەم بنەماڵەیە رووخاو پاش چەند گۆڕانێك ڤێتنام کەوتە ژێر دەستی حوکمی چینی‌یەوە ٠

## چین و داگیرکردنی ڤێتنام

تا کاتی یەکگرتنەوەی چین سێ خێزانی شایانە حوکمی چینیان کردووە کە سێهەمیان تا سەدەی سێهەمی زایین حوکمیان گێرا٠ شانشینە کانی ڤێتنامی کۆن بەردەوام هێرشی چینیان دەکرایە سەر بەڵام وەنەبێت دەستەوئەژنۆ دانیشتبێتن ،بەڵکو بەرەو رووبان بوونەتەوەو قوربانی‌یان داوە ٠

هەروەکو ووتمان لە سەرەتادا شانشینی ئۆلاك بەرهەڵستی‌یەکی زۆری داگیر کەرانی چینی کرد ،بەڵام بێهوودە بووو لە دواییدا خۆی دایە دەستەوە ٠

بەم جۆر ناوچەکانی باکوورو ناوەراستی ڤێتنام هەر لە ساڵی ١١١پ٠ز تا ساڵی ٩٣٨ی زایین کە یانزە سەدە دەکات لە ژێر دەستی

داگیرکەری چینیدا دەیناڵاند • لەم ماوە دوورو درێژەدا ڤێتنام بــــە شێوەیەکی پچرپچر سەربەخۆیی وەرگرتـــــووە •

حوکمی چینی رژێمی دەرەبەگی بەسەر خەڵکی ڤێتنامدا سەپانـــــە ،باجێکی زۆری خستە سەر خەڵـك ،لە رێگــەی بلاوکردنــەوەی بوذیو کۆنفۆشیۆسیدا پیتەکانی نووسینو رۆشنبیری چینیان بەسەر خەڵکدا هەروەها لەم ماوە درێژەی حوکمی چینیدا گەلی ڤێتنام ژمارەیەك شۆرشی بەرپاکردووە ،لەوانە شۆرشی جوتیاران دژی کۆیلایەتـــی زەویو بەرزی باج ،ئەم شۆرشە کورسی چینییەکانی هێنایە لەرزین ،تا ئەوەبـــوو لە ساڵی ٥٤٤ی زایین بە شۆرشێکی فراوان دەرکران ،بەڵام دوای ئەوە دووبارە دەستیان بەسەر ڤێتنامدا گرتەوە •بەڵام لە ساڵی ٩٣٨ی زایین هێزی چینییەکان لە شەری (باش‌دانگ)دا بە تەواوی تێكشکاو ئـــەم ساڵە بە ساڵی کۆتایی داگیرکردن دادەنرێ •

لە ساڵی ٩٣٩ زایینی بریاری دروستبوونی شانشینی ڤێتنـــام درا بە سەرۆکایەتی سەرۆکی میللی (نجوکواین) •لەو رۆژەوە ڤێتنـــــام چووە قۆناغێکی نوێی ژیانییەوە کە تیایدا شارستانیەکەی پەرەیسەندو وولات یەکـــیگـــرت •

بارودۆخی ڤێتنام بەو شێوەیە مایەوە تا ساڵی ١٠١٠ی زایینـــی لە خێزانی (لی) حوکمیان گیرا •لە کاتی حوکمرانی ئەم خێزانە توانرا وولات لە مولکدارە دەرەبەگە چینییەکانو لـــە رژێمی دەرەبەگایەتـــــی رزگار بکەن ،هەروەها وولات بـــە دروستکردنـــی پـردو جۆکەلـــــەو هێنانەکایەوەی پرۆژەی ئاودێری بوژێنرایەوە •

دوای رووخانی خێزانی (لی) ،خێزانی (تران) هاتنه سەر حوکــم که تا کۆتایی سەدەی چواردە حوکمیان گێرا ٠لە سیفەتەکانــی وولات لە کاتی حوکمرانی ئەم خێزانــەدا دیــاردەی پێشکەوتنــی ئابــووریو دروست بوونی کەسایەتی ڤێتنامی بوو لە بــەشی سەرووی هینــــدی چینــیدا ٠

لە گرنگترین ئەو کارەساتانەی بەسەر شانیشنی ئەنامدا هات سێ هێرشەکەی مەگۆلیەکان بوو که سووپایەکی بێشوومــاریان تیــــا بەکارهێنا ،بەلام گەلی ڤێتنام توانی بیان شکێنێو لە وولات دەریـــان پەرێنــێ ٠سەرکــەوتنی ئەنامیــــەکــان بەســەر مەغۆلیەکـــان دەگەرێتەوە بۆ ئەو ستراتیجییەی (تران هۆنگ) گرتی‌یەبەر کـــــە توانی لە دانانی نەخشەیەك بۆ یەك خستنەوەی گەل لە رووی داگیر کەراندا سەربکەوێت ،هەروەها سەرکەوت لــە رێکخستنی بەرگــری ســەربازی کە هەموو گەل هاوبەشی تیا بکات ،ئەم رێکخستنە بـــووە هــــۆی هێنانەکایەوەی جۆرە هاوکاری‌یەك لە ژیانی کۆمەلایەتــیو ئابــووریدا ،هەروەها یارمەتی دروستبوونی کەسایەتی ڤێتنامیدا ٠

## شارستانیەتی هیندی لە ناوەراستو خوارووەدا

رەگەزی شامپا کە لە لێوارەکانی ناوچەی ئەنــام نیشتەجــــێ ببوون لە باری زمانەوە سەر بە کۆمەڵەی گەلانی (مەلایۆ بۆلێنزی)یە ٠

ئیمپراتۆریەتی چینی لەبەر دوو هۆی سەرەکی نەیتوانی سەربــەم زمانە شۆربکـــات :ـ

١ ـ شوێنی ناوچە کەنارییەکان دووربوون لە بنکـەی حوکمـی چینییەوە کە ئەمەش پێویستی بە سوپایەکی گەورەو ئازووقەیەکـــی ئێجگار زۆر هەیە ٠

٢ ـ سەختیو پارچە پارچەیی ناوچەکە وای لە خەڵقی کرد کـــە بە ئاسانی بەرهەڵستی چینییەکان بکـــەن ٠

ڕەگەزی شامپا توانییان لە سەدەی دووەمی زایندا شانشینێـــك (مملکة) دروستبکەنو شاری (لین‌یی) بکەنە پایتەختی کە ناوێکـــی هیندیان (سمهابورا) لێنابوو ٠ بەهۆی پێشکەوتوویی شارستانی هیندی لە ناوچەکەو پێشکەوتوویی بازرگانی توانرا پەیوەندی بازرگانـــی لەگەڵ چیندا ببەسترێ٠ بەڵام خامیرییەکان کە لە دەشتەکانی باشووری نیمچە دورگەی هیندیچینیو ناوچەی کەمبۆدیا نیشتەجێ ببوون توانیان ئیمپراتۆریەتێ دروستبکەن ، پاشان توانیان دەستبگرن بـەســـەر دەشتەکانی باشووری ڤێتنام ٠وە هەوڵی فراوانکردنی دەسەڵاتـــی خۆیاندا ،بۆ ئەم مەبەستە هەڵسان بە داگیرکردنـی شارەکـــانی ڕەگەزی شامپا ،بەڵام ئەوەندەی نەبرد لێیان سەندرایەوە

## دروستبوونی کەسایەتی ڕۆشبنیری ڤێتنامی

ئەو داگیر کردنە دووردرێژەی ڤێتنام لەلایەن چینەوە کـە یانـزە سەدەی خایاند ،بوو بەهۆی کارتێکردنی شارستانیو ڕۆشنبیری چینی لە ژیانی بەشی باکووری ڤێتنام ٠بوذیو زردەشتی بڵاوبووەوە ،یەیکـەرو پەرستگاکان لەسەر شێوەی چینی دروستکران ٠هەروەها ئەدەبو زمانی چینیش کاری خۆی کرد کە دەتوانرا بە شێوەیەکـی ڕوون لـــە بەکارهێنانی ئەبجەدی چینی لە نووسینی ڤێتنامیدا هەستی پێبکەین ٠

ئەم بارودۆخە تا نیوەی سەدەی سیبانزە بەردەوام بوو کـــــە بروتنەوەیەکی رۆشنبیری بەهێز لەناو گەلی ئەنام دەستی پێ‌کرد کـــە سەرکەوتنەکانی گـەلی ئەنام بەسەر داگیرکەری مەغۆلی بناغەکـــەی پتەو ئەکرد ،چونکە ئەمسەرکەوتنانەوای لەگەڵ‌کرد کە هەست بەکەسایەتی خۆی بکات ۰لەبەر ئەوە دەستی کرد بە پێگەیاندنی ئەوەی میللی بەزمانی نشتمانی هەروەها نووسینی چینی گۆری بە جۆرێکی تری ئەبچـــەدی ئاســـــان ۰

سەرەڕای ئەم یەکیانی‌یە میللی دیسانەوە هەندێك گیروگـــرفت سەری هەڵدا وەك ململانێی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری نێوان خاوەن ملکـــە دەرەبەگەکان‌و کۆیلەکان‌و جوتیاران ،ئەمەش یەکێك بوو لەو پاشمـــاوە خراپانەی کە حوکمی چینی بەجێی هێشتبوو ۰

لە سەرووی ئەم هەموو گیروگـرفتانەوە توانرا زۆر پـــرۆژەی چاك‌کردنی کشتوکاڵ‌و رێکختنی ئاودێری بهێترێتە کایەوە ،بـــەڵام لە رووی حوکمداری‌یەوە چینێك لە وولاتا گەشەی کرد کـە بە(مانداریـن) یان حوکمی‌دارە ناوخۆیی‌یەکان ناسرابوون ،کە حوکمی لادێ‌و شـــــارە بچووکەکانیان ئەکردو هەوڵی پلەی بەرزتریان لە حوکمدا ئـــەدا ۰

لە ئەنجامی زیادبـــوونـی بزوتنـــەوەی جوتیاران‌و کشتیـاران دژی دەرەبەگەکان کە دەسەڵاتیان لە کۆتایی سەدەی چواردەهەمدا رووی لـــە زیادبوون بوو ۰لە ژێر سەرۆکایەتی (هۆکای‌لی) بزوتنەوەیەکی نـــوێ دژی خێزانی (تران) سەری‌هەڵدا، چونکە ئەم خێزانە لەگەڵ دەرەبەگ‌و خاوەن ملکەکان دەست تێکەڵاوبوو لە چەوساندنەوەی گەل ۰بەهـــۆی داواکاری‌یە پیرۆزەکانی ئەم جووڵانەوەیە کە بریتی بوو لە چاککردنـــی

باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری ،توانی ڕای گەل بەلای خۆیدا ڕابکێشێت‌و لە ساڵی ١٤٠٠ی زایینی بەسەر خێزانی حوکمداردا سەربکەوێت ٠دوای ئەوەی هۆکالی حوکمی دەستگیر بوو بڕیاری ڕزگارکردنی کۆیلەی‌دا ،بەلام تەنها توانی بەشێکی کەمی لێ بەئەنجام بگەیەنێت ،هەروەها نەیتوانی لە لەناوبردنی دەستەلاتی ئۆرستۆقراتی‌دا سەربکەوێت ٠ بەم جۆرە چەند گیرو گرفتێك سەری هەلدا وەك زۆرانباری نێوان گەل‌و چینی ئۆرستۆقراتی ،هەروەها چەند تاکە کەسێکی خێزانی (تران) یاخی‌بوون‌و لە هەندێ شوێنی وولات حوکمیان ئەگێرا ٠ئەم گیروگرفتانە ڕێگای بۆ چینی‌یەکان خۆش کرد کە لە سەدەی ١٥دا ڤێتنام داگیر بکەن ٠پاش داگیرکردنی باکووری ڤێتنام ،چینی‌یەکان گەلێك ڕێگای جۆراو جۆریان بۆ لەناوبردنی گیانی نەتەوایەتی بەکارهێنا ،بەلام هەموو ئەم ڕێگایانە بەرامبەو بەهێزی گەل چۆکی دادا ٠گەلی ڤێتنام وەئەبێت دەستەوئەژنۆ لەڕووی داگیرکەران وەستا بێت ،بەڵکو شۆڕشێکی فراوانی بەرپاکرد کە بە دەرکردن‌و ڕاونانی داگیرکەران کۆتایی هات ٠

لە ساڵی ١٤١٨ زایینی شۆڕشێکی میللی بە سەرۆکایەتی یەکێك لە خاوەن موڵکەکان بە ناوی (لی‌لوا) بەرپابوو ،کە بەرەبەرە توانی زۆر ناوچەی ڤێتنامی باکوور بخاتە ژێر دەستی‌یەوە ٠زۆر لە جوتیاران‌و زەحمەت کێشانی گەل بەپیری ئەم شۆڕشەوە چوون ٠ حوکمدارانی چینیش ئەوپەڕی هێزیان بۆ سەرکوت کردنی ئەم جووڵانەوەیە خستەکار ،لە سەرەتادا پەنجا هەزار سەربازیان خستە مەیدانی شەڕەوە، بەلام بە تێکشکاوی گەڕانەوە ٠دوای ئەوە سەد هەزار سەربازی تریش بەشداری‌یان تیاکرد کە ئەنجامی ئەمانیش

ئەوانی پێشوو باشتر نەبوو ٠ پاشان لە ساڵی ١٤٢٧ زایینی سەدووپەنجا هەزار سەربازی تر روویان لە مەیدانی شەر کرد کە لە ئەنجامدا لـــە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا لە شاری (شیالانگ) شەرێکی خوێنــاوی روویدا ،کە تیایدا سوپای چینی بە جۆرێك هەرەسی هێنا کە هەرگیــز خۆی نەگرێتــــەوە ٠

بەم جۆرە جارێکی تر حوکمی بێگانە لە سەر ڤێتنام لاچــــــوو وگەل خۆی حوکمی خــۆی کــردەوە ٠ کۆمەڵگـای ڤێتنامــی شــێوەی شانشینێکی جێگیری وەرگرت کە چینی ماندارین بەرێوەیان دەبرد ٠لە دیاردەکانی ژیانی نوێی ڤێتنام ئەم چەند خاڵە دەخەینە روو :ــ

١ ــ زاڵ بوون بەسەر دیاردەی دەرەبەگایەتی کۆن ٠

٢ ــ سوپای دەوڵەت لە جوتیاران پێکهاتبوو ،دەبوایە هەمــــوو جوتیارێك مەشق لەسەر چەك بکات بۆ خزمەتی سوپا بەبێ ئەوەی ئیشی کشتوکاڵی فەراموش بکات کە بناغەی ژیانیانە ٠

٣ ــ بەهێز بوونی مەرکەزی ئایینی کۆنفۆشیۆسی لەناو گەلــدا ٠

٤ ــ رژێمی بەرێوەبردن لامەرکەزی بـــوو ٠

٥ ــ هەندێك رەگەزی وەك (ثای و شامپا) لەچیا سەختەکانــــدا مانەوەو ژیانێکی خێلایەتی ئەژیان ٠ئەم رەگەزانە هەندێ یەکـــــەی بچووکیان دائەمەزراند ، بەلام تەگەرە نەبوون لە رێگەی سەربەخۆیــی شانشینی ئــــەنام

پاش لاچوونی حوکمی بێگانە لەسەر ڤێتنـام ،ئیتر خێزانـــــە حوکمدارەکان لەناو خۆیاندا دەستیان کرد بەشەڕو ئاژاوەنانەوە کــــە ماوەیەکی زۆری خایاند ، تیایدا ژیانی گەلێك جوتیارو زەحمەتکێشــ بوو بە خۆراکی ئـــەم شەڕانـــە ٠

کار بەم جۆرە ڕۆی بەرێوە تا ئیمپریالیزمی ئەوروپا بیری لـــە داگیرکردنی ڤێتنام کردەوە :
بەم چۆرە دەبینین کەمێژووی کونو ناوەراستی ڤێتنام بریتی‌یـــەلـــە خەبات لە پێناوی دروستکردنی کەسایەتی‌و شارستانی ڤێتنامی ٠

ئەم مێژووە پڕە لە وێنەی پرشنگداری ئەو بزوتنەوە میللی‌یانەی کە جوتیاران پێی‌هەڵسان دژی دەرەبەگ‌و کۆیلایەتی٠ لەچاوخشاندێنك دا بەسەر مێژووی ئەم گەلــە قارەمانــەدا دەبینین هــەرگیز خـــۆی نەداوەتە دەست داگیرکەرانەوە ،بەڵکو تا کۆتایی‌و تا دواتنۆکی خوێــن بەرهەڵستیانی کردووە بۆ بەدەستهێنانی ئازادی‌و سەربەخۆیی ٠ئەم گەلە نەبەردە بەدرێژایی مێژووی کۆن وناوەند پارێزگاری لە رۆشنبیری‌و شارستانی خۆی کردووە کە لە ناخی ئەو کۆمەڵەوە هەڵقووڵاوە ٠هەروەها هەرگیز ئەو شارستانی‌یە بەهێزانە کاری لێنەکردووە کــە هەوڵـــــی خۆسەپاندنی بەسەریدا داوە ،بەڵکو هەروەك گەلانی تری ئازادیخــواز سوودی لە شارستانی داگیرکەران وەرئەگرێ ولە شارستانی ڕەسەنـــــی خۆیدا دەیتوێنێتەوە ٠

# چەرخی ئیمپریالیزمی ئەوروپا

## سەرەتای هاتنی ئیمپریالیزم

بەدرێژایی سەدەی شانزەهەم ئیسپانیی و پورتوگالییەکان لە دەریاکانی رۆژهەڵاتدا پێشبڕکێیان دەکرد ٠ لەگەڵ گەیشتنی پاپۆرە ئیسپانیی و پورتوگالییەکان بۆ ئەو ناوچانە هەندێ نێرداوی کاثۆلیك(١) گەیشتنە کەنارەکانی ئەنامو کەمبۆدیا ،کە لە سەرەتادا نەیان توانی دابەزنە ناوچەی تۆنکین لە باکوور ،ئەویش بەهۆی بوونی شانشینێکی بەهێز ،هەروەها بەهۆی خۆبەستنەوەی تەواوی گەلی ڤێتنام بە رۆشنبیری باووباپیرانەوە ٠ ئەم نێرراوانە لەگەڵ بازرگانە پورتوگالیی و هۆڵەندییەکان دەهاتن بۆ ئەوەی شانبەشانی بازرگانە هیندییەکان لە مەڵبەندە بازرگانییەکانی سەر کەناردا ئیش بکەن ٠

لە کۆتایی سەدەی شانزە ڤێتنامی یەکان دەستیان گرت بەسەر زەویوزارەکانی کەنارو شامپایان دەرکرد ،وە دەستیان کرد بەبلاوکردنەوەی رۆشنبیریو دەسەڵاتی خۆیان تیایدا ٠

---

(١) نێرراوە ئاینییەکانی ئەوروپا بەدەم مەبەستیان بلاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی بوو ، بەڵام لە ناوەرۆکدا رێ خۆش کەر بوون بۆ گەشەپێدانی دەسەڵاتی ئەوروپاییەکان لەسەر ئەو ناوچانە ، کە ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ هاتنی ئیمپریالیزم ٠

ئەم نێرراوانە جگە لە ڤێتنام روویان لە زۆر شوێنی تر کرد وەك لوبنان ، سوریا ، فەلەستین ٠٠ هتد ٠

ئەم نێرراوانە لە سەرێکی ترەوە کارێکی باشیان کردە سەر بزوتنەوەی رۆشنبیری لەو ناوچانە چونکە ژمارەیەکی زۆر قوتابخانەو چاپخانەیان لەو شوێنانە دائەمەزران ، هەروەها ئەمانە بوون بە هۆی هاندانو بوژانەوەی زانستو زیندووکردنەوەی بیروباوەری نەتەوایەتی لەنێو رۆڵەکانی گەلدا

ف ٠ هـ ٠ م

ئیمپریالیستەکان کەلێك کێشەیان هاتە رێگا کەوا ڤێتنامییەکان بۆیانیان دانابوو ،لەبەر ئەوە بەدانانی چەند نێرداوێك لە وولاتدا راوەستان ٠

هۆلەندییەکانیش هەمان شێوەو وویستیان دەست بەسەر هەندێ شوێنی کەناریدا بگرن ،بەلام هەموو هەوڵدانەکانی کۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی هۆلەندی بۆ جێگیرکردنی جێ پێیان لە ئەنامی ناوەراست سەری نەگرت ٠

فەرەنسییەکان لە چارەکی دووەمی سەدەی حەڤدەهەم هاتنە مەیدان ،کە لە ساڵی ١٦٢٥ زاینییەوە یەکەم خۆلێ خشاندن روویدا ،کاتێك کە (ئەلکسەندەر دیرۆدس) سەری لەناوچەی (کۆشینچین) داو یەکەم (اسقفية)ی(٢) لە ناوچەکە دامەزراند ، وە دەستی کرد بەلێکۆلینەوەی زمانی ئەنامیو فەرهەنگێکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە دانا کە لە پیتیو لاتینی پێکهاتبوو ٠

چالاکی نێرداوی فەرەنسی هەر بەمەوە نەوەستا بەلکو کۆمەڵەیەکی نوێ لە فەرەنسا پێکهێنرا بەناوی (کۆمەڵەی نێرراوەکان لە دەرەوە) کە ئەندامەکان بریتی بوون لە لاوە مەسیحییەکان ٠ئەم کۆمەڵەیە هەموو توانایەکی بۆ مەسەلەی ئەم نێرراوانە لە هیندی چینی بەکارهێناو بەدرێژایی سەدەی حەڤدەهەم تەنها بەبازووی خۆی کاری دەکرد بێ ئەوەی حکومەت یارمەتی بدات ٠

---

(٢) اسقفية : جێگای کۆبوونەوەو دانیشتنی قەشەکان بوو ف ٠ هـ ٠ م

## نێرراوان ڕێگا بۆ ئیمپریالیزمی فەرەنسی خۆش دەکەن

لە سەردەمی لویسی چواردەهەمەوە یارمەتی حکرمەتی فەرەنسا بۆ ئەم نێرراوانە دەستی پێ کرد کە ویستی دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرێت ٠بۆ ئەم مەبەستە هانی نێرراوانی داو بەپارە یارمەتی یانی دا ،هەروەها ئارەزووی بەستنی پەیوەندی لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی (سیام هەبوو ٠

بیری دانانی موستەعمەریەکی فەرەنسی لە تەنیشت هند لە ساڵی ١٧٦٣ سەری هەڵدا ٠بەهۆی یەکێك لە قەشەکانی فەرەنساوە توانی پەیوەندی لەگەڵ ئەمیر (نجوین ئانا) ببەستێت کە بە بەرهەڵستیکردنی بزوتنەوەی میللی ناوخۆیی (تاءسن)ەوە خەریك بوو ٠ئەمیری ناوبراو داوای یارمەتی لە حکومەتی فەرەنسا کرد فەرەنساش هیچ پیسکەیی یەکی لە پێشکەشن کردنی یارمەتی بۆ ئەمیری ناوبراو نەنواند ٠

ئەوەبوو ئەمیر نجوین توانی لە نێوان ساڵانی ١٧٩٢ ـ ١٨٠٢ی زایینی بەسەر بزوتنەوەکەی (تاءسن)دا زاڵ بێو دەست بەسەر تۆنکیندا بگرێ ٠وە دووبارە ڤێتنامی یەكخستەوە خۆی کرد بەسەرۆکی ئیمپراتۆری یەتەکە کە ناوی (جیالۆنگ)ی لێنا٠ئەم ئیمپراتۆریەتە بووە لایەنگیری تەواوی نێرراوەکانو لە سەردەمیدا جۆرە پەیمانێك لە نێوان ئیمپراتۆرو حکومەتی فەرەنسا دروست بوو ،بەڵام ئەمپەیمانە ئەنجامی باشی نابێت ئەگەر فەرەنسا دەستبەسەر ناوچەکەدا نەگرێو موستەعمەرەیەکی تیا دروست نەکات ٠

دوای مردنی جیالۆنگ دوو حاکمی تر حوکمیان گرته دەست گــــــە دەستخستنە کاروباری ناوخۆ لەلایەن فەرەنسی‌یەکانەوە قەبوول نەکردو دەستیان کرد بە هاندانی ئەو بزوتنەوانەی کە دژ بەچالاکی ئێرراوەکانن ·لێرەدا دەرکەوت کە هەموو هیوایەکی فەرەنسا بۆ گرتنی هیندی چینی چووە گلەوە ،قەشەو نێرراوەکان تووشی کوشتن‌و برینێکی زۆربوون ·

لە سەردەمی ئیمپراتۆر (تۆدۆك) هەولی زیندوگردنەوەی ئایینـــــە نیشتمانی‌یەکان دەدراو نێرراوە مەسیحی‌یەکانیان بە تێکــدەری گــــەلی ڤێتنام دەدایە قەلـــــەم ·

لە سالی ١٨٣٩ پاپا دانی بە نێرراوە فەرەنسی‌یەکان لە هینــــدی چینی نا · لەوکاتەوە بزوتنــەوەی نێرراوەکان لایەنگیری‌یەکی رەسمــی وەرگــــرت ·

بەم جۆرە فەرەنسا بۆ داگیرگردن بیانووی بۆ پەیدابوو ،بــــۆ ئەم مەبەستە دەستی‌کرد بە ناردنی سوپا ،کە لە لایەن گــەلی ڤێتنامــەوە بەرهەلستی‌یەکی توندی لێدەکرا ئەم سوپایە توانی لە سالی ١٨٥٨شاری (دانانج) پاشان لە سالی ١٨٥٩ سایگۆن بگــرێت · بــەم جــۆرە ســێ بەشەکەی رۆژهەلاتی کۆشین‌چین سەری بۆ داگیرکەری فەرەنسی شۆرکرد پاشان حاکمی فەرەنسی ئەمیرال (دی‌لاجراندی‌یە) دەستی کرد بە ناردنی سوپا بۆ سەر پاشماوەی کۆشین چین کە لە ئەنجامدا توانی بەتــەواوی داگیری بکات‌و روو لە کەمبۆدیا بکات ،تا ئەوەبوو لەسالی ١٨٦٣ پاراستنی لەسەر ئاشکرا کـــرد ·

## دەست گرتنی فەرەنسا بەسەر هیندی چینیدا

پاش دەستگرتن بەسەر کۆشینچین ،فەرەنسا توانی لــــــە پێنج ساڵی داهاتوودا سێ وولایەتەکەی رۆژئاواش بگرێت ،هەروەهـــا پاراستنی لەسەر کەمبۆدیا ئاشکرا کرد پاشان دەستی کرد بە رۆیشتــن بەرەو میکۆنگ ٠

لە ساڵی ١٨٧٣ یەکێك لە ئەفسەرە فەرەنسییەکان هەڵمەتێکـــی بەربلاوی گردەسەر دەلتای ڕووباری سوور بەمەبەستی چوونە ناو ناوچەی تۆنکین ،بەلام لە شەرێکدا کوژرا ٠ئیتر فەرەنسییەکان نــــەیانوویست سوپای تر بنێرن بۆ تۆڵەسەندنەوە ،لەبەر ئەوە دەستیان بە ووتووێــــژ لەگەل ئەنام کرد کە بە بەستني ڕێکەوتننامەیەکی ئاشتی لە ساڵی ١٨٧٤ دوایی هات کە بەو پێیە دەبێت ناوچەی تۆنکین لە رووی بازرگانـــیو چالاکی نێرراوانی ئایینی فەرەنسی کراوبێت ٠

تالاکی بازرگانی فەرەنسی یەکان لە ناوچکە دوژمنایەتی یەکی بــۆ ئێتنامییەکان خولقاند ،ئەویش بەهۆی بەربەرەکانی کردنی بازرگـــــانە نشتمانییەکان ٠بەم ڕجۆرە جوولانەوەی دژ بەبازرگانی فەرەنسا پەیدابوو کە وای لە فەرەنسا کرد سوپایەك بە سەرۆکایەتی (فرانسیس گارنییـــە) بنێرێ ،کە لە ئەنجامدا توانی شاری هانۆی داگیربکـــــات ٠

لە ساڵی ١٨٨٥ پاراستن لەسەر ئیمپراتۆریەتی ئەنام ئاشکرا کـــــرا لە ساڵی ١٨٨٧ فەرەنسا بریـــاری یەکگـــرتنی هەر چـــوار بەشــــە داگیرکراوەکەی هیندی چینيد ا(کۆشینچین ،کەمبۆدیا ،ئەنام ،تۆنکین)٠

له سالی ١٨٩٩ لاوسیش گیراو ئاشکــرا کرا که هیندیچینی وەك یەکەیەکی سیاسی یەکگرتوو وایە کە سەر بە فەرەنسایەو لە هــــــەر پێنج بەشە ناسراوەکەی پێكهاتووە ٠

## حوکمی فەرەنسا لە ڤێتنــــام

فەرەنسا لە ڤێتنامدا بە پێی بارودۆخی هەر ناوچەیەك پــەیرەوی یاسای دەکرد ٠دوای لێبوونەوە لە داگیرکردنی ناوچەی کۆشینچین کــە بەشی باشووری ڤێتنامدەنوێنێ ،دەستیکرد بەدانانی فەرمانبەرو ئەفسەرە فەرەنسییەکان لە جێگەی سەرۆکە ناوخۆییەکان کە بــە (مانداریــــن) ناسرابوون ،چونکە ئەمانە لەگەڵ حوکمی فەرەنسا تەبا نەبوون ٠

دوای تەواو بوونی حوکمی سەربازی لێکدانی بەشەکانی ڤێتنــــام ،ئەمیراڵ (یۆنارد) کرا بە یەکەم حاکمی ناوچەکە ،بەڵام گــەل بەمـــــە ڕازی نەبوو تا ساڵی ١٨٦٣ لەسەر خەباتی خۆی سووربوو ،کـــــــە لەم ساڵەدا فەرەنسا هەڵسا بە دانانی یاسایەکی نوێ کە بەشێوەیەکـــی ناراستەوخۆ حوکمی ووڵات بکات ٠هەموو سەرۆکە ناوخۆییەکانیـــــان بۆ سەر ئیشە کۆنەکانیــان گێڕایــەوە ،بــەڵام لــە ژێر سەرپەرشتـــی فەرمانبەرە فەرەنسی یەکـــان ٠

بەهۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێوانیاندا واز لــەم یاســایەش هێنراو بۆ فەرەنسا دەرکەوت کە حوکمی ڕاستەوخــۆ باشترین ڕێگــەی دەســت بەسەرا گـــرتنە ٠

پاشان ئەمیراڵ (دیلاجراندییە) هاتە سەر کورسی حوکمو یاسای ماندارینی هەڵوەشاندەوەو دەستی کرد بە دانانی نەرەنسی لە هەمـــوو ئیش‌وکارێکـــــدا ٠

ئەم مووچە خۆرە لاوە فەرەنسی‌یانە هەڵیژێردرابوون‌و خرابوونــە کۆلێجی تایبەتی بۆ مەشق‌کردن لەســەر بەرێوەبــردن ،بەلاَم کــاروباری پیرانی‌لاریّ تەنها سەرۆکە ناوخۆیی‌یەکان بــەرێوەیان دەبــرد ٠ئــەم سیاسەتە هیچ هەنگاوێکی باشی بۆ راکێشانی گەل نەنا ،بەڵکـــــو بەپێچەوانەوە بووە زیاتر رق هەڵسانی گــەل دژی فەرەنسی‌یەکـــان‌و داب‌و نەریتیان ،ئەمەش لە ئەنجامی ئەو خراپەکاری‌یەی کە ڤێتنامی‌یەکان رووبەرووی دەبوون لە لایەن ئەو لاوە فەرەنسی‌یە لە خۆبایی بووانـــەی کە بە داب‌و نەریت‌و شارستانی‌یەتیان فیزیان بە سەر گەلی ڤێتنام لیّ ئــەدا ئەم ئەنجامە فەرەنسی‌یەکانی ناچار کرد بــۆ گەڕانەوە بـــۆ حوکمــــی ناراستەوخۆ ئەویش بە بەکاهێنانی هەندیّ حوکمداری ناوخۆ بەلاَم بـــە شێوەیەکی فراوانترو لە ژێر ڕێز گرتنێکی زیاتر بۆ یاســـا

بیشتمانی یەکان ٠ئەم کارە بووە هۆی بەرەبەرە هێمن بوونەوەی ناوچەی کۆشین‌چین ،کــە توانرا هــەندیّ چاك‌کــردنی ئابــووری بهێنرێتە دی ٠ گرنگترینیان دروست‌کردنی بەندەری سایگۆن بوو لە سالَی ١٨٦٧ کردنی بە مەلَبەندی ناردنە دەرەوەی برنجی زیاد لـــــە پێویست ٠

سەرەرای گرتنی گشت ناوچەکانی هیندی چینی کــە بە گرتنـــی تۆنکین لە سالَی ١٨٨٥کۆتایی هات ،ئیمپریالیزمی فەرەنسی نەیتوانــی خۆی بە تەواوی جێگیر بکات ،بە هۆی دووبەروو‌بوونەوەیان لەگـــەڵ نەتەوەیەکدا کە خاوەنی شارستانی‌و ڕۆشنبیری تایبــەتی خــــۆیاتن هەرچەندە گیروگرفتی ماددی‌و ئابووری بەزۆری سەری هەڵنەئەدا ،بەلاَم کێشەی سەرەکی ئەوەبوو کە فەرەنسی‌یەکان نەیان توانی شارستانــی‌و رۆشنبیری‌یان بەسەر گەلدا بسەپێنن ٠وە بە درێژایی حوکمیان لـــــە ڤێتنام ناکۆکی ئایدیۆلۆجی هەر بەردەوام هەڕەشەی لە فەرەنسا دەکرد

٠لەبەر ئەم هۆیانە لە کانوونی یەکەمی سالّی ١٨٨٥ لیژنەیەکی تایبەتـی لە پەرلەمانی فەرەنسی کۆبۆوە بۆ لێکۆڵینەوە لە باری ناوچە داگیرکراوە نوێکان ٠دوای سێ رۆژ بریاری دەست هەلّگرتن لە ناوچەکە دەرکـــزا ٠ ئەویش لە ئەنجامی ئەو گیروگفتانەی فەرەنسا لە هیندیچینی بــــە گشتیو ڤێتنــام بەتایبەتی تووشی دەبـــوو ٠

حکومەتی فەرەنسا ناچار بوو لیژنەیەکی تریش دابنا کە لە چەنـد قەشەیەك پێکهاتبوو بۆ دانی رژێمێك کــە هــاوکاری نێوان هێــــزی فەرەنسیو گەلی ئەنام مسۆگەر بکات ،وە بریاری ئاشتی لە وولاتـــــدا بدات ،بەردەوام کاربکات لە پێناو هێنانەدی شارستانی فەرەنسی لــــە ناوچەکە هەلّبکات ٠ لە ئەنجامدا (بۆلّبەرت) هەلّبژێردرا بە جێنشینی هەمیشەیــی لەســەر ئەنــامو تۆنکین ٠پــۆلّبەرت تەقەللای دانانـــی ئەوجوومەنێکی کــرد بۆ لەناوبردنــی ناکۆکــی نێــوان نشتمانــــیو فەرەنسییەکان ،وە نزیك خستنەوەیان لەیەکتر ٠

دوای مردنی بۆلّپەرت لە کۆتایی سالّی ١٨٨٦دا ئەوانــەی بـــوون بە جێنشینی وەك (دیلانیسانو ئارمان رۆسۆ)ویستیان لەسەر هەمـــان رێباز برۆن ،بەلاّم سەرنەکەوتن چونکە گەلو ماندارین سەبری ئـــــەم ئەنجوومەنەیان دەکرد وەکو داردەستێك بۆ خۆسەپاندنیان بەسەر پیاوە نشتمانییەکـــان ٠

حوکم تا سالّی ١٨٩٧ بە شێواوی مایەوە کە لەم سالەدا (بـــۆلّ دۆمیر) بوو بە حاکمی ناوچەکەو پەیرەوی سیاسەتی توندو کـــــرد ،رژێمە کەی وەرگێراو هەموو جۆرە حوکمێکی دایە دەست فەرەنسییەکان لەگەلّ دانانی چەند رارێژکارێك لە ڤێتنامییـە بەکرێگیراوەکـــــان

٠هەرچەندە ئەم سیاسەتەی بۆل دۆمیر دەسگەوتێکی ماددیو ئابووری زۆری فەرەنسا گەڕاندەوە ،لە هەمان کاتدا بووە مایەی زیادبوونی قینی گەل بەرامبەر داگیرکەری فەرەنسی ،وە سەرەتایەك بوو بۆ هاوکاری نێوان سەرۆکە نشتمان پەروەرەکانو گەل بۆ رزگاربوون لە دەسەلاتی بێگانە ٠نا لەم کاتەوە سەرەتای بزوتنەوەی نیشتمانی دەستی پێکرد ٠

تا هەلگیرسانی شەڕی جیهانی یەکەم فەرەنسا هەر یە دوو دلی مایەوە لە نێوان سیاسەتی حوکمی راستەوخۆو ناراستەوخۆ ٠

لە سالی ١٩٠٢دا ( بۆلبۆ ) بوو بە حاکمی ناوچەکەو هەولی چارەسەری ئەم هەلویستەیدا ،وە چاویکی تری بە سیاسەتی هاوبەشیکردنی نشتمانییەکان لە بەرێوەبردنو حوکمدا گێڕا ٠لە ئەنجامدا بریاری دروستکردنی ئەنجوومەنی راوێژکاری لە تۆنکین دەرکرد ٠

ئەم حاکمە بۆ هێمن کردنەوەی ڕقی هەلچووی هاولاتیان هەندێك چاکەکاری کرد وەکو لایەنی خزمەتگوزاری تەندروستیو فێرکردن ،دابەش کردنی وولات لەسەر بناغەی یەکەی بەرێوەبردنی کۆن ٠

سەرەرای هەموو ئەمانە بلێسەی ئاگری شۆرشی لەبن نەهاتووی گەل لە ئەنام هەر دەگەشایەوەو تینی بۆ ناوچەکانی کۆشینچینو تۆنکین دەگوێزرایەوە ئەم بزوتنەوەیە بەیەکەم بزوتنەوەی داواکردنی رزگاری دادەنرێت هەروەك لەمەولا دەیبینین ٠ کاتێك لە سالی ١٩٠٨دا ئەم شۆرشە لە توندترین شێوەیدا بوو (بۆلبۆ) لە کارخراو حاکمێکی نوێ بەناوی (کلۆبۆکۆسکی) لە جێگەی دانرا کە پەیرەوی سیاسەتی

توندوتیژکانی کـــرد ،زانکۆکانی داخستو ئەنجوومەنی راوێژکـــاری هەڵوەشاندەوەو ئەنجوومەنێکی نـوێی دروستکرد کـــە سەرۆکـــە بەکرێگیراوەکانی تیا دامەزراند ٠

بەڵام ئەم سیاسەتەش بێسوود بوو ،لەبەر ئەوە لـە ساڵی ١٩١١ حاکمێکیتر بەناوی (ئـەلیێرت سارۆیان) بوو بـە جێنیشنی حاکمـــی پێشوو کە پەیمانیدا بەجێبەجێکردنی بەرنامەیەکی نوێ کە لەســـــەر بناغەی سوود وەرگرتن لە هەڵەکانی رابردوو دانرا ٠بەپێی ئــــــەو بەرنامەیە هەڵسا بە پێنج چاکەکاری :

١ ــ دامەزراندنی ئەنجوومەنی راپەراندن (مجلس تنفيذي) ٠

٢ ــ پتەوکردنی ئۆتۆنۆمی لە هەرێمە جیاوازەکان ٠

٣ ــ قەدەغەکردنی کاری دژوارو توندوتیژی دژی هاوولاتیان لـــە لایەن فەرمانبەرە فەرەنسییەکانەوە ٠

٤ ــ بەکار هێنانی یاسا میللی یەکان لە ئاستە جیاوازەکاندا ٠

٥ ــ پێش کەشکردنی خزمەتگوزاری فێرکردن بـــە شێوەیەکـــی فـــــــراوان ٠

بەڵام ئەم چاککردنانەش گەلی قایل نەکرد ،لەبەر ئەوە فەرەنســــــا ناچاربوو سیاسەتێکـی نوێ بگـرێتەبـەر ،ئەویش بەهاندانـی بۆرژواو پاشماوەی دەرەبەگەکانو حوکمدارە کۆنەکانو خێترانە حوکمدارەکان بۆ هاوکاری کردن لەگەڵ لایەنە فەرەنسییەکـان بەمەبەستی راکێشانیـان

بەرەو حوکمی فەرەنسی،کە لە ڕێگەی ئەمانەوە دەتوانرێ دەست بەسەر گەلدا بکێشرێت ٠

هەروەها فەرەنسا سیاسەتێکی بەربلاوی لە فێر کردندا بەکارهێنا بۆ بلاوکردنەوەی زمانی فەرەنسیو دروست کـردنی ڕۆشنبیری‌یەکـــی فەرەنسی لە ناوچەکەدا بۆ هێنانەکایەوەی کۆمەڵـە کەسانێك کـــــە مێشکیان بە ڕۆشنبیری فەرەنسی زاخاو درابێ،تا لە خزمەتی بەرژەوەندی فەرەنسی کاربکەن(٣) ٠

لەپاڵ سیاسەتی مژینی گـەڵو سیاسەتی دوو دڵـی لە حوکمـــی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، سیاسەتێکی تایبەتی تری بەکارهێنا کـــــە ئەویش سیاسەتی (جیاوازی بکە سەردەگەوێ) بوو ٠بۆ بەجێ‌گەیاندنـــی

---

(٣) ئیمپریالیزمی فەرەنسی سیاسەتی تایبـەتـی خـۆی هەبوو لـــــە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ گەلانـی ژێر دەستەدا کە مەبـەستی دەستبەسەرا گرتنیانە ٠ بێگومان ئەم سیاسەتە لەگەڵ سیاسەتـی وولاتە ئیمپریالیزمی‌یەکانی تردا جیاوازبوو ، بەلام لە ئامانجـــدا هەموو یەك دەگرنەوە ئەویش ڕاووڕووت کردنی گەلانە ٠
ئیمپریالیزمی فەرەنسی هەڵئەسا بە بایەخدانێکی تەواو بەلایەنـی ڕۆشنبیریو فێر کردن ، قوتابخانەو چابخانەیەکی زۆری دەکردەوە ڕۆژنامەو گۆڤاری دەردە کرد٠بەلام‌ئەم‌هەموو شتانە بەزمانی فەرەنسی دەنووسران ، جارجاریش زمانی نیشتمانیی تیا بە کارئەهێنـــرا ٠ ئەوەی لە گۆڤارو کتێبەکان تۆماردەکران هەموو ڕۆشنبیری وولاتی ئیمپریالیزم بوو ٠ مەبەستی فەرەنسا لەم کارەیدا زاخاوکردنـی مێشکی قوتابیانو خەلکی بە ڕۆشنبیری بێگانە بوو ، جگە لـەمـە تواندنەوەی هەستی نەتەوایەتی لەدڵو دمرووتی خەلکەکە بـــوو ٠ ئەوساکە (بەپێی باوەڕی ئیمپریالیزمەکان) خەلکەکە لە بەر هەڵستی دەگەون چونکە هەستی نەتـەوەیی‌یان لە دلدا نـەمـاوە ٠ بـەلام خەیالیـان خاوبـــوو ٠ (ف٠هـ٠م)

ئەم سیاسەتە نامرۆڤایەتی‌یەی دەستی‌کرد بە کارکردن بۆ قەدەغەکردنی هەموو جۆرە یەکگرتنێك لە نێوان ئەو یەکە سیاسی‌یە نوێیانەی خۆی دایمەزراندوون ،دابەش‌کردنی هیندی چینی بۆ پێنج بەش کە کەمبۆدیا ولاووس‌و کۆشین‌چین‌و ئەنام‌و تۆنکینە دیاردەیەکی ئاشکرای ئەم سیاسەتە بوو ·

جیاکردنەوەی لاووس‌و کردنی بە یەکەیەکی سەربەخۆ هۆیەك بوو بۆ دابڕانی گەلەکەی‌و قەدەغەکردنی یەك‌گرتن لەگەل گەلی کەمبۆدی ڤێتنامی بۆ سێ بەش دابەش کرد کە کۆشین‌چین لە باشوورو ئەنام لە ناوەراست‌و تۆنکین لە باکوور کە هەریەکەیان رژێمێکی بەڕێوەبردنی تایبەتی بەسەردا سەپێنرا ·

ئەمیش لایەنێکی روونی سیاسەتی (جیاوازی بکە سەردەکەوی)یە چونکە ئەم ناوچەیە پێش هاتنی ئیمپریالیزم بە ماوەیەکی دوورودرێژ خاوەنی یەکێتی‌یەکی سیاسی تەواو بووە · دیسانەوە ئەم سیاسەتە بەرامبەر خۆراگری‌و وورە بەرزی گەل چۆکی دادا ·

گەلی ئەنامی توانی یەکێتی‌و رۆشنبیری‌و شارستانی خۆیان بپارێزن ،وە هەرگیزاو هەرگیز بەوە ڕازی نەبوون کە شارستانیەتی باووباپیران لە شارستانیەتی فەرەنسی‌دا بتوێتەوە ·

## بزوتنەوە نەتەوەیی‌یە سەرەتایی‌یەکان

یەکێك لەو دیاردانەی کە سووربوونی گەلی ڤێتنام لەسەر نەتەوایەتی‌و شانازی کردنی بە کەسایەتی‌و رۆشنبیری خۆی دەردەخات

بزوتنەوەی بەرهەڵستی کردنی نێرراوە مەسیحی یەکان بوو لەلایەن ئـــەو پاشایانەی دوای جیالۆنگ هاتنە سەر تەخت ٠

گەل دژی حوکمی فەرەنسی بوو ، هەر کاتێـك فەرەنسا حوکمـی ڕاستەوخۆی بەکاربهێنایە ڕائەپەرین ، بەرپەچی لووتبەرزی فەرمانبەرانی فەرەنسی یان دەدایەوە کە بە داب و نەریتی خۆیان فیزیان بەسەر گەلـدا دەکرد ، هەروەها بە حوکمی ناراستەوخۆ قایل نەئەبوون ، چونکە ئـــەو سەرۆکە ناوخۆیی یانەی لە ماندارینیان هەڵئەبژارد لیوونـــە ماشـــەی دەستیان بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتە گڵاوەکانیان ٠

بێ گومان ئەم باردۆخە هەروا بە خۆرایی بەسەر جوتیاری ڤێتنامـی تێ ناپەڕێت بەڵکو لە دژی ماندارین و پیرانی وولات کە داردەستی حوکمی بێگانە بوون شۆرشیان دەکـــــرد ٠

گەلی ڤێتنام هەر لە یەکەم ساتی ئیمپریالیزمی فەرەنسی یـــــەوە شۆرشێ بوو لەسەر ئیمپریالیزم ٠ نووسەری فـەرەنسی (بـــۆلدی لاباری یە) لەکاتی هێرشی یەکەمی فەرەنسا بۆ سەر کۆشینچین لە ساڵی ١٨٦١ ئەم راستی یە دەردەخات و دەڵێ :ـ

(ناوچەکانی بەرهەڵستی هەر لە خاکەوە هەڵدەقووڵا ، هیچ شوێنێك نەبوو مەڵبەندێکی دیاری کراوی بەرهەڵستی بێت ، بەڵکـو بەرهەڵستی لـــە هەموو لایەکەوە بوو ، ژمارەیکی زۆر مەڵبەندی بەرهەڵستی هەبوو ، بـــە جۆرێك هەر ئەنامی یەك لە جێگە ی خۆیدا مەڵبەندێکی بەرهەڵستی بـــوو زۆر جوانترە ئەگەر بڵێین هەر جو تیارێك کە لە چاندنی مەرەزە کـــاری دەکرد لە جێگەی خۆیدا مەڵبەندێك بوو لە مەڵبە ندەکانی بەرهەڵستی) ٠

نووسەری نشتمانی (نجوین دن‌کیاو) توانی زیاتر ئەم قسانـــەی بۆڵدی لاباری‌یە بسەلمێنێ ، کە لەم پارچە ئەدەبی‌یەدا هەڵوێستی ساڵـی ١٨٦١ی گەل ڕوون دەکاتەوەو دەڵێت :ـ

(هیچ سەربازێك لە ئارادا نەبوو کە تەنهـا ئیشی شـەڕ بێت ،بەڵکـو ئەو دانیشتوانە لادێیە ساکارانە بوون کە لە کێڵگەکـان ئیشیان دەکرد ،لەبەر خۆشەویستی خاکی باووباپیـران ڕوویان لـــە شەڕکرد ٠جلە سەربازی‌یەکانیان ئەو جلە کۆنانە بوون کە لە کاتـــی ئیش کردندا لە بەریان دەکرد بۆ بەدەست هێنانی بڕێك مەرەزە کـــە پێی بژین ٠چـــەکەکانیان بریتـی بـــوو لە داری بامبۆ(٤) ،داوای شمشێرو تۆپیان نەئەکرد ، چاوەڕێی فەرمانی سەرۆکیان نەئەکـــرد ،ڕووبەڕووی دوژمن ئەبوون هەروەك دوژمن لە مەیدانا نەبێت ،بەبـــێ ترس لە گوللەو تۆپو تفەنگەکانی دوژمن هێرشیان دەکردو لە دوژمنیـان دەداو دەیان ترساندن ٠لە کاتی هێرشدا دەنگیان سەر دەنگی تـــۆپو تەقینەوەی بۆمباکان دەکەوت ،گوللە تۆپەکانی دوژمن بەفیرۆ دەڕۆیـــی هەروەك نیشانەی خۆی نەزانێت) ٠

لە نێوان ساڵی ١٨٦١ەوە تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم گەل هـــەر بەردەوام بوو لە سەر خەباتی خۆی ٠لەم ماوەیەدا ژمارەیەك سەرۆك لـــە نێو جوتیاران‌و سەرۆکەکۆنەکـان‌و هەندێ لە سەرۆکـە ئایینی‌یـــە کۆنفۆشی‌یەکان هەڵکەوتن ئەم بزوتنەوەیە هەموو لادێ‌و شارو کێڵگەیەکی گرتەوە ٠فەرەنساش ئەم جووڵانە وانەی بەهێزی سەربازی‌و چەکـــی زۆرو چاکەوە دامر کاندەوە ،بەڵام ئەوەنـدەی نەبـرد شۆڕشی تـــر هەڵگیرسایەوە ٠

---

(٤) بامبۆ : جۆرە دارێکە لە ڤێتنامدا باوە ٠ (ف٠هـ٠م)

ئەم بەرهەڵستی یە سەرەتایی یانە ئەوەی کەم بوو کە سەرۆکێکی یەکگرتووو رێکخستنی تیا نەبوو ، هەروەها نەبوونی چەکی نوێ و خیانەتکاری پیاوە ئابیینی یەکان وهەندێ لە سەرۆکە ناوخۆیی یەکان لە کەم وکوڕی یەکانی شۆڕش بوون ٠

هەموو ئەم بزوتنەوانە توێنرانەوە جگە لەو بزوتنەوەیەی کە لە ناوچەی شاخاوی (یانثی) سەری هەڵدابوو کە یەکێك لە سەرۆکەکانی بە ناوی (هوونگ هۆنسام) توانی لەو ناوچەیەی تیایدا یاخی بووە بەرهەڵستی حوکمی فەرەنسی بکات ٠بەڵام لە سالی ١٩٠٠ەوە فەرەنسا هێرشی فراوانی دەکردە سەری ،تا ئەوەبوو لە سالی ١٩١٣دا ئەم بزوتنەوەیەش لەناوبراو سەرۆکەکەی بەدیل گیرا ٠

سەرەڕای هەوڵدانەکانی فەرەنسا بۆ هێشتنەوەی گەلی ڤێتنام بەدا براوی لە جیهانی دەرەوە،سەرکەوتنەکانی ژاپۆن بەسەر رووس دا لە سەرەتای سەدەی بیستەم وای لە گەلی ڤێتنام کرد کە دەرك بە راستی یەك بکات ئەویش توانای گەلانی ئاسیایە بۆ راوەستان لە ڕووی ئەو هێزە ئەوروپایی یەی کە بەرەو ڕۆژهەڵاتی دوور (الشرق الاقصى) کشاوە سەیر کردنێکی پاڵەوانانە سەیری سەرکەوتنی گەلی ژاپۆنیان دەکرد کە بووە هۆی هاندانی دروستبوونی یەکەم بزوتنەوەی ڕێكوپێك بە سەرۆکایەتی (فام بۆی کاو) کە سەرۆکایەتی چەند شۆڕشێکی جیاوازی کردووە دژی حوکمی فەرەنسی ٠ ئەم شۆڕشگێرە گەلێك شوێنەو شوێنی کردووەو هانی خەڵکی داوە بۆ داواکردن بۆ هاتنە سەر تەختی ئەمیری نشتمانی (شۆنگ دی) کە یەکێکە لە نەوەکانی جیالۆنگ ٠بەڵام زۆرداری و چاوگێرانی فەرەنسا بەدوایاندا ناچاری کردن کەبەرەو ژاپۆن

هەڵبێن‌و لەوێداتوانی‌یان‌لە ڕێگەی چاپ‌کردنی بڵاوکراوەو بڵاوکردنەوەی شیعرو ئەدەبی نەتەوایەتی گیانی نشتمان‌پەروەری بڵاوبکەنەوە ، ئەویش بە ناردنی ئەم چاپ کراوانە بۆ وولات ٠

ئەم بزوتنەوە نشتمانی‌یە وای لە حاکمی ئەوسای فەرەنسی (ئەلبرت ڕۆس) کرد کە بەرنامەیەکی نوێ دابنێت بۆ وەڵام دانەوەی داواکاری‌یەکانی گەل ،بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە چونکە داواکاری‌یەکانی گەل لە چاك‌کردنی دەستوورو بەڕێوەبردن پەڕیوەتەوە بۆ داواکردنی سەربەخۆیی تەواو ٠

سەرەڕای ئەم هەموو چاك‌کردنانەی دەستوور لە ساڵی ١٩١٣ شۆڕشێکی بەتین بەرپابوو کە هەموو وولاتی گرتەوە ٠لەم کاتەشدا ئامیر شۆنگ‌و سەرۆکی نشتمانی (فام بۆی کاو) گەڕانەوە بۆ وولات ٠لە کۆتایی ساڵی ١٩١٣ حکومەتی فەرەنسا بە دڕندانەترین شێوەی سەرکوت‌کردن شۆڕشی دامرکاندەوە ،دوای ئەوەی بیری ڕزگاری‌و سەربەخۆیی بووە ئامانجێکی میللی گشتی‌و زۆر گرانە بتوانرێ لە ڕووی شۆڕشگێرانەی گەلی ڤێتنام بوەستێ کە خاوەنی سەدان شەهیدی ڕێی ڕزگاری‌یە ٠

ئەوەی شایانی باسە شۆڕشی ساڵی ١٩١١ی چین کە دروست‌بوونی کۆمنتانگ (پارتی نشتمانی بەسەرۆکایەتی تشان کای‌تشیك)ی بەدوادا هات بووە هۆی‌دروست‌بوونی پارتە سیاسی‌یەکان لە ڕۆژهەڵاتی‌دووردا ،لە ڤێتنامیشدا پارتی نشتمانی ڤێتنامی دامەزرا کە ناوی (ڤێتنام ــ کواك‌وان وانگك)ی لە خۆی‌نا ٠ئەم پارتە لە ساڵی ١٩١٤ یەکەم کۆنفرانسی لە دەرەوەی وولات لە کانتۆن لە چین گیرا ، ئەمەش لە ئەنجامی ڕێگەنەدانی

فەرمانڕەوا فەرەنسی‌یەکان بە هیچ جۆرە چالاکی‌یەك لەناو وولاتدا کــە هەمیشە ئامادەی گرتنی سەرۆكو لایەنگرانی بوون ٠

**ماوەی نێوان هەردوو جەنگ**

ماوەی نێوان هەردوو جەنگی یەکەمو دووەمی جیهانی ١٩١٤-١٩٣٩ بە چارەکە سەدەیەکی زۆرانبازی دادەنرێت لە نێوان حوکمی فەرەنسی‌و لایەنە نشتمانی‌یەکان لە ڤێتنام ٠لەم ماوەیەدا بزوتنەوەی نشتمانی‌یــــە تەواوی‌و بە شێوەیەکی ئاشکراو ڕوون گەشەی دەکرد ، ڕۆژ بەرۆژیشــی ناوەرۆکی فەرەنسا زیاتر ڕوون دەبۆوە ٠

لەم ماوەیەدا حکومەت هەڵسا بــــە لەناوبردنــی ڕژێمی کۆمیــۆن (کێڵگە کۆمەڵی‌یەکان) کە بووە هۆی پەیدابوونی چینێك لە مولکــــــدارە کشتوکاڵی‌یەکان ،هەروەها بە هۆی لێ‌سەندنەوەی کێڵگە لە جوتیاران‌و بەخشین بە فەرەنسی‌یەکان‌و لایەنە بازرگانی‌یە چەوسێنەرەکان چینێــك لە بۆرژوا سەری هەڵدا ،جگە لەمانە چینێك کرێکاری بەستراو بـــــــە (استثمار)ی فەرەنسی‌یەوە هاتنە مەیدانی ژیان ٠

بایەخ پێدانــــی حکــــــومەت بە چاندنــــی ( الغلات النقدیة )(٥) وەفەرامۆش‌کردنی چاندنی بەروبوومی خواردەمەنی بووە هۆی بڵاوبوونەوەی هەژاری لە لادێکانی نشتمان‌و پاڵنان بە جوتیارانەوە بۆ کۆچ کــــردن لە لادێکانەوە بۆ شارەکان بــۆ گەڕان بەدوای کــارێکدا ٠ئەم کــــارەی

---

(٥) الغلات النقدیة : واتە بەرووبوومی نەقدی کە ئەو بەرووبوومانـــە دەگرێتەوە کە حکومەت لە بە کارهێنانی ناوخۆدا سەرفی ناکـــات بەڵکو دەینێرێتە دەرەوە ، کە بــەرامبەر ئـــەوە پارە وەردەگرێت (ف٠ هـ٠م)

حکومەت بووە هۆی پەیدابوونی سوپایەك لە کۆچ کردووان کە بەکرێیەکی زۆر کەم ئیشیان دەکردو لە کاتی بێکاریدا هیچ جۆرە مافو کرێیەکیان نەئەدرایێ کە پێی بژین ،جێگەی خەوتنیشیان بریتی بــوو لـــە لاجادەو

ژێر دارەکــــــان ٠

بەم جــۆرە دەبینین کـــە بـــەرژەوەندی بازرگـــانو دەرەبەگــــــکو سەرمایەدارەکان بە مانەوەی فەرەنساوە بەسترابوو ٠ فەرەنساش ئەمەی بە هەلزانی بۆ فریودانیان ،لەبەر ئەوە دەستی کرد بـــە بەلێندان بــــەم کەسانە گوایە مافی دەستووری زیاتریان پێدەبەخشێ ٠

لە ماوەی دوای جەنگدا گەلێ کۆمەلەی نشتمانی جیاواز دامەزرا ،پارتی نشتمانی ڤێتنامیش بەباشی گەشەی کردو دان بە بوونیانرا ،هەروەهـــا گەلێ کۆمەلەی تریش دامەزرا کە هەموویان داوای چاککردنی دەستوورو حوکمێکی نشتمانی ناوخۆیییان دەکـــرد ٠ بازرگانەکــــان مەبەستیان بەهێزکردنی چالاکی بازرگانی بوو لەگەل فەرەنسادا ٠

لەمەوە بۆمان روون بۆوە کە هەموو کۆمەلەو پارتە نشتمانییەکان لە بارێکدا بوون کە پێچەوانەی خواستو داواکارییەکانی گەلی ڤێتنام(٦) بوون ،چونکە بەرژەوەندی ئەم کۆمەلانە بە مانەوەی فەرەنساوە بەندبـــوو

---

(٦) لەبەر ئەوەی ئەم کۆمەلەو پارتانە لە چینی دەرەبـــەگو بـــۆرژوا دروست ببوو ، دەبینین کە ئەم جۆرە کەسانە ناتوانن خـــــواستو ئامانجی گەل بهێننە دی چونکە بەدی هێنانی تەواوی ئامانجەکانی میللەت لە بەرژەوندی ئەم جۆرە کەسانە دەدات ،لەبەر ئـــەوە تـــــا ئەو کاتە لەگەل شۆرشو جوولانەوە نیشتمانییەکان دەبن کــــــە بەرژەوەندی خۆیانی تێدا بێت ،بەلام لەوە بەدوا وازی لێ دێنـــــن یان لەرێ لائەدەن ٠ بەشداری کردنیشیان لەسەرەتادا دەگەرێتەوە بۆ هەستی نەتەوایەتی ئایینی ٠٠ هتد (ف٠هـ٠م)

ئەمەش لە کاتێکدا جوتیاران لە برساندا دەیان ناڵاند ،کێڵگەکانیـــان دابەش کرابوو ،هەژاریو نەخوێندەواری ببوە نەخۆشی یەکی کوشـندەی ناو کۆمەڵ ،کرێکاران بەکرێ یەکی کەمەوەو نـەبوونی هیـچ جـــــۆرە خزمەتگوزاری یەك رۆژیان بەسەر دەبرد ، بێکاری ڕووی تێکردبـــوون ،تووشی چەندەها خراپەکاری دەبوون لەلایەن خاوەن ئیشەکانەوە ،هیچ یاسایەك لە ئارادانەبوو مافی ئەم لێقەوماوانە بپارێزێ ٠

هەڵمەتی پروپاگەندەی سیاسی ناوخۆ چ لەلایەن ڕێکخـــــراوە نشتمانی یەکانو چ لە لایەن جوتیارو کرێکارە رۆشنبیرەکانەوە هـــــەر بەردەوام بوو ٠ لە چیندا ڕێکخراوێك بەناوی (ڕێکخـــراوی گــەلە زۆر لێکراوەکان) دروست بوو کە بایەخی بە ئەنام دەداو داوای جێکردنــی (بانگەوازی ویلسون)ی(٧) دەکـــــــرد ٠

پەیوەندی نێوان کرێکارانو فەرمانبەران تێكچوو ،قوتابیان چەندەها خۆپیشاندانیان نوانـد بــە تایبەتـــی دوای دروست بوونی (یەکێتـــی

---

(٧) پاش تەواوبوونی شەڕی جیهانی یەکەم کە بە شکانـــــی ئەڵمانو دەوڵەتی عوسمانی ،وە سەرکەوتنی سوێندخۆرەکان کۆتایی هـــات ، لە ساڵی ١٩١٩دا کۆنگرەیەك لە شاری پاریس بە نێوان دەوڵەتە شەڕکەرەکان بەسترا کە چارەنووسی جیهان لەسەر ئەنجامەکانـــــی ئەم کۆنگرەیە وەستابوو ٠
ویلسۆنی سەرۆکی ئەمریکـــی لە سەرووی هەموویانـــەوە داوای سەربەخۆییو پزگاری گەلانی ژێردەستەی ئەکـــــرد ٠ بـــــەڵام داواکاریەکەی هیچی لێ جێبەجێ نەکرا ٠لە کۆتایی کـۆنگرەکـەدا بە ئاشکرا بڕیاردرا کە نابێت گەلانی ژێر دەستە هـــــەروا بەجـێ بهێڵدرێنو کار بدرێتە دەستی خۆیان ، بــەڵکو دەبێت چاودێـری کەرێکیان هەبێت ٠ ئا لەم کاتەوە بیری ئینتداب بەسەر گەلانـــــدا سەری هەڵــــــدا ٠ (ف٠هـ٠م)

شۆرشگێری قوتابیانی ئەنام)یان بە زمانی ڤێتنامی پێی دەڵێن (ثان نی ثا)
فرید جرین دەڵێت : (لە گرنگترین هۆیەکانی تەشەنە کردنی گیانــــی
نەتەوایەتی لەناو گەلی ڤێتنامو بەرپابوونی بزوتنەوەی نشتمانی هەوڵدانی
فەرەنسیەکان بـــوو بـۆسەپاندنــــی شارستانێتی فــەرەنسـی
بەسەریانــــدا بەبێ ئەــەوەی کاربکــــەن بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی
ژیانی ڤێتنامییەکان بۆ ئاستی ژیانی فەرەنسییەکان ٠ ئازادی سیاسی لە
هیندی چینی بە هەموو جۆرە رێگەیەکی سەرکوت کردن قەدەغە کرا بـــوو
کەچی لە وولاتی خۆیاندا رێگەیان دەدا ٠ هەروەها مێژووی داگیرکردنی
فەرەنسی لەگەڵ نەبوونی سیاسەتێکی فەرەنسی چەسپاو ،جگە لەمانــە
ئەو بارە ئابووریە خراپەی کە لە ئەنجامی بە تالان بردنی بەروبوومــی
وولاتو بەکارهێنانی بەروبوومــی سروشتیو مرۆڤی بۆ بەرژەوەنــدی
ئابووری فەرەنسا پەیدابوو ٠ ئەم هەموو هۆیانە بوونە هەوێنی تەقینەوەی
ئاواتەکانی گەل بۆ رزگاربوون لەم حوکمە ئیمپریالیزمە ،تا ئەوەبـــوو
بە هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی دووەم ئەو بارودۆخە هاتە کایەوە) ٠

ئەمانەی باسمان کردن هۆی ناوەکی بوون، بەلام چەند هۆیەکـــی
دەرەوەیش هەیە کە ئەمە کورتەکەیەتی :ـ

١ ـ سەرکەوتنەکانی ئاسیا بەسەر ئەوروپادا پێش سەرکەوتنــی
ژاپۆن بەسەر روسیادا ساڵی ١٩٠٥ ٠

٢ ـ پەیدابوونی بزوتنەوەی نشتمانی ئاسیایی لە هەندێ ناوچەی
دراوسێ پێش سەرهەڵدانی بزوتنەوەی نشتمانی چین لە ســـاڵی ١٩١١

٣ ـ سەرهەڵدانی بنەمای مافی دیاری کردنی چارەنووس لە دوای
شەڕی جیهانی یەکەم کە ویلسۆن (سەرەك کۆماری ئەوسای ئەمریکـــا)
بانگەوازی بۆ دەکـــرد ٠

٤ ـ پەیدابوونی بزوتنەوەی نەتەوەیی غاندی لە هیند ٠

هەموو ئەم بزوتنەوانە یارمەتی هۆکارە (عامل) ناوەکی‌یەکانـــی‌دا بۆ بەرپابوونی بزوتنەوەی نشمانی لە ڤێتنام ،وە پەرەسەندنی لـــــە داواکردنی چاككردنی دەستوورو ئازادی‌یە شارستانیـەکان (الحریـــات المدنیة) بۆ داواکردنی سەربەخۆیی‌و رزگاری ٠ پاش تێپەربوونی ماوەی نێوان هەردوو جەنگ ،لە ڤێتنامدا ژمارەیەك رێکخراوو پارتی سیاســـی دامەزرا کە ئەرکی بزوتنەوەی نشتمانی‌یان گرتبووە ئەستۆ کە ئەمانـــە گرنگـــــە کانیانن :

١ ـ پارتی نشتمانی ڤێتنام ( کۆرك دۆن وانگ ) کە لە ســـالی ١٩١٢ دروست بوو ،وە یەکەم کۆنفرانسی لە سالی ١٩١٤ لە چین بەست

٢ ـ یەکێتی قوتابیە شۆرشگێرەکان(ئان نی ئا)

٣ ـ دەستەی لاوە شۆرشگێرە ڤێتنامی‌یەکان یان (کۆمەڵەی گەلـە رۆرلێ‌کراوەکان) کە لە سەرەتادا هۆشی‌منە(٨) دایمەزراند ، لە ســـالی

---

(٨) هۆشی‌منە لە سالی ١٨٩٠ لە (کیم لینی) لەدایكبووە ٠ باوکـــــی خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرابوو لە ئەدەبی چینی ٠ لە منداڵیدا ناوی (نجوین سینە کۆنگ) یان لێنابوو ٠ لە سالی ١٩٠٠ دایکی کۆچی دوایی کــــــرد ٠
کاتێك تەمەنی گەیشتە دە سالی باوکی ناوی گۆری بۆ (نجوین ئاە ئانە) ، لەم کاتەدا باوکی لەیەکێك لەقوتانجانەکان ناونووسی کرد لە سەرەتای لاویدا خۆی گەیاندە یەکێك لە رێکخراوەکان بەناوی رێکخراوی (بزوتنەوەی نوێ کردنەوە) کە ئامانجی کەم کردنەوەی باج‌و وازهێنان لە کاری دژواری دژی هاوولاتیان بوو ٠ لە سالی ١٩١١ بۆ ماوەی حەوت مانگ لە یەکێك لە قوتانجانەکان دەرسی دەووتەوە ٠ دوای وازهێنان لـە کاری دەرس ووتنـەوەژیانی =

١٩٢٥دا گۆڕی بۆ پارتێکی کۆمۆنیستی لە ژێر ناوی (تان نین کاســـن مانگدۆنگ) بارەگاکەشی لە باشووری چین بـــوو ٠

---

= ژێردەستەیی تەنگی پێ هەڵچنیو بەرێگەیەکـــی تایبەتی بـــەرەو دەرەوەی وولات ملی ڕێی گرتەبەر ٠ لە دەرەوەدا گەلێ ئیشـــی کردووە تەنها بۆ ئەوەی بژێو نانی سك پەیدا بکات ٠ سەرەڕای ئەو ژیانە تاڵەی تیا ژیاوە هەمیشە ڕۆژنامەو کتێبی خوێندۆتەوەو خۆی لە خوێندنی قوتانجانە نە پچڕاندووە ٠

پاش هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی یەکەم بەرەو پاریس ڕۆی پاشان بۆ ئەمریکا کە لەوێدا دەیبینی سپی‌یەکـــان بەرۆژ نیوەرۆ بـــێ بەزەیی‌یانە قولەڕەشەکات سەردەبڕن ، بەچاوی خۆی خۆپیشاندانی کرێکارانی بینی ٠ لە دەرەوەدا بەردەوام خەریکی نووسینی ووتارو لێکوڵینەوە بوو ، یەکەم ووتاری لە ڕۆژنامەی (لۆمانتیە)ی پاریسی لە یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٢ بلاوکردەوە کە لە خراپەکـــاری ڕژێمی سەرمایەداری دەدوا ٠

لە ماوی ژیانیدا لە دەرەوەی وولات گەلێك ناوی جیا جیای لەخۆی نابوو وەك (نجوین ئای کـــووك ،لی ثوی ، فوونگ صون نهـــی ، شاوتشین ، تونك شان سۆ) ، بەلام‌لەدواییدا ناوی (هۆشی‌منە)ی لە خـــۆی نا کـــە تامردن ئـــەم ناوەی بەخۆیـــەوە پاراست لەساڵی ١٩١٩ بۆ یەکەم جار دەنگی گـــەلی ڤێتنامی گەیانـــــدە کۆنگرەی پاریس ٠ لە ساڵی ١٩٢٠ بوو بە ئەندام لە پارتـــــی کۆمۆنیستی فەرەنسی ٠

بەیانیان لە ستۆدیۆکان فلیمی دەشوشتەوە ، کاتەکانی تـــــری ڕۆژیشی بە چالاکی سیاسی دەبردەسەر ٠

لە ساڵی ١٩٢١ بەیارمەتی پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسی تـــوانی ڕێکخراوی (دەستەی وولاتە ژێردەستەکانی ئیمپریالیزم) دروست بکات کە هەموو ئەو بزوتنەوە شۆڕشگێڕانەی دەگرتە خـــــۆی کە لە ژێر دەستی ئیمپریالیزمی فەرەنسی دا بوون ٠
لە ساڵی ١٩٢٣ هۆشی‌منە گەیشتە مۆسکۆ بۆ بەشداری کردن لـــە کۆنفراسی یەکەمی جوتیاران ، کە لە ئەنجامدا بە ئەندامێکی =

## ٤ ـ دروست بوونی دوو پارتی کۆمۆنیستی تر لە ساڵی ١٩٢٥ ٠

= لیژنەی راپەڕاندن (اللجنة التنفیذیة)ی کۆنفرانسەکـە هەڵبژێردرا وەکو نوێنەرێکی جوتیاران لە ناوچە داگیر کراوەکـــان ٠
لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٤ گەیشتە کانتۆن لە چین بـــــۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی ڤێتنامی ٠
لە ساڵی١٩٢٦ کتێبێکی بەناوی (رێگای شۆرشگێڕانە) بڵاوکردەوە
لە ساڵی ١٩٢٧ بەرەو شەنگەهای ، یەکێتی سۆڤیەت ، برۆکسل ، فەرەنسا ، ئەڵمانیا ، سویسرا ، ئیتالیا گەشتی کرد ٠
لەپایزی ساڵی ١٩٢٨ ئەوروپای بەجێهێشتو رووی لە تایلاند کرد بۆ یارمەتی دانی جووڵانەوەی ڤێتنامییەکان لەوێدا ٠
لەساڵی ١٩٣٣ رووی لە یەکێتی سۆڤیەت کرد ، لەوێدا لـــــە (پەیمانگەی) لێکۆلینەوەی نیشتمانیو ئیمپریالیستی) کاری دەکرد٠
دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ چین بۆ خـۆ گـەیاندن بـە بزوتنـەوەی وڵاتەکەی ٠ لە ١٩ی ئاپاری ساڵی ١٩٤١ بەرەی (فیتمنـــە)ی دروست کـــــرد ٠
لە ساڵی ١٩٥٤ بوو بە سەرۆکـی حکومەتـی کـــۆماری ڤێتنامی دیموکـــرات ٠
هۆشیمنە دوای ئەوەی تەندروستی لەشی تێك دەچێو هەمـــوو جۆرە هەوڵدانێ بۆ رزگارکردنی بەئەنجام نەگەیشت ، لە رۆژی ٤ ئەیار لە ساڵی ١٩٦٩ چاوە گەشەکانی بۆ هەتا لێك ناو مردن ئەم خەباتگێڕەی راپێچاو بەرەو گۆرستانی تەنگی بـــرد ٠
لە ٢٩ی ئاپاری هەمان ساڵدا یادی لە دایکبوونی ٧٩ ساڵـــــەی گێـــــردرا ٠
لەساڵی ١٩٧٤دا حکومەتی ڤێتنامی دیموکرات لەشاری هانـۆیدا پەیکەرێکی بۆ ئەم شۆڕەسوارە دروستکرد ٠
ئەم خەبات گێڕە لە گەورەترین دەرگاوە ناوی خـۆ خستە مێژووەوە ، توانی گەلێکی مردوو بژێنێتەوە ، سەرۆکایەتی میللەتێکی لەدوو شەڕی گەورەدا کرد ٠ خەباتەکەی دژی فەرەنسا بە پاك کردنەوەی وڵات لە ئیمپریالیزمی فەرەنسی کۆتایی هات ، بەڵام ئەو شەڕەی دژی وڵاتە یەکگرتووەکان (ئەمریکا) گێڕای ئەوەی سەلمـــاند کە هێزی ماددی سنوورێکی هەیە بەرامبەر بەمرۆڤ ٠ بەڵام ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە بەچاوی خۆی یەکێتی ڤێتنامی نەدی ٠

٥ ـ له سالی ١٩٣٠ هۆشی‌منه هه‌لسا به یه‌ك‌خستنه‌وه‌ی هـــه‌ر سێ پارته کۆمۆنیستی‌یه‌کان بۆ یه‌ك پارتی کۆمۆنیستی هیندی‌چینی بو کارکردن له کۆمنتـــــرن ٠

هه‌ر له ســـالی ١٩٢٥ه‌وه شۆرشگێران ده‌ستیان کــــرد بـــه ته‌قاندنه‌وه‌ی بۆمباو نارنجۆك له شاره گه‌وره‌کان‌و مه‌لبه‌نده‌کانـــی میری‌دا ٠له سالی ١٩٢٩ دا له شاری سایگۆن‌و هانۆی‌و هایفۆنگ ژماره‌یـــه‌ك خۆپیشاندان روویدا کـــه بـــووه هۆی لێکدانـــی چـــه‌کدارانـــه‌ی نێـــوان خۆپیشانده‌ران‌و فه‌ره‌نسی‌یه‌کان ،وه له هه‌ردوو شه‌وی ٩ـ١٠ی شوباتی سالی١٩٣٠دا له شاری(یین) لێکدانێکی چه‌کدارانه له‌گه‌ل فه‌ره‌نسی‌یه‌کان روویدا که له ئه‌نجامدا زیاتر له ده ئه‌فسه‌ری فه‌ره‌نسی کوژران ٠وه‌سه‌ر له‌به‌یانی هه‌مان رۆژ ده‌یان نارنجۆك هاوێژرایه ناو خانووبه‌ره‌کانـــــی میری‌و مه‌لبه‌نده‌کانی به‌رێوه‌بردن‌و کۆمپانی‌یه فه‌ره‌نسی‌یه‌کان له هانۆی گه‌لێك رووداوی‌تر له شاره‌کانی تری ڤێتنام روویدا ، وه تێکچوونـــی باری شاره‌کان به درێژایی هه‌ردوو سالی ١٩٣٠ـ١٩٣١ هـــه‌ر به‌رده‌وام بوو ٠به‌لام ئه‌م بزوتنه‌وانه به هێزێکی گه‌وره‌ی سه‌ربازی بۆ ماوه‌یه‌کـــی کورت دامر کێنرایه‌وه ئه‌م هه‌موو تێکچوونه‌ی بـــاری وولات فه‌ره‌نسای ناچار کرد که ده‌ست بکات به زیادکردنی ژماره‌ی نشتمانی‌یه‌کان لـــه پایه‌کانی (مناصب) حکومه‌تدا ،هه‌روه‌ها رژێمی مانداریني له‌گه‌ل هه‌ندێك گۆرران گێرایه‌وه که شێوه‌ی له‌حوکمی ناوخۆیی فه‌ره‌نسا بچێت ،له‌هه‌مان کاتدا یارمه‌تی بۆ نێر راوه ئاییني‌یه‌کان زیاد ده‌کرد بۆ ئه‌وه‌ی چالاکی‌یان زیاد بکات له راکێشانی نشتمانی‌یه‌کان به‌ره‌و مه‌سیحی کاتۆلیکی ،تـــا بیان‌کات به هۆیه‌ك بۆ نانه‌وه‌ی ئاژاوه له نێوان ریزه‌کانی گه‌لدا ٠ بـــۆ ئه‌م مه‌به‌سته له سالی ١٩٤٠ ده‌ستی کرد به دامه‌زراندنی ژماره‌یـــه‌ك فه‌شه‌ی نیشتمانی و پێکهێنانی (اسقفية)ی نشتمانی بۆ کێش‌کردنـــی

دانیشتوان بەرەو لای خۆی شەڕی دووەمی جیهانی هەلگیرساو گـــەلی ڤێتنامیش گەیشتونە پلەیەکی بەرزی پێگەیشتنی سیاسی ،وە ســوورە لەسەر رۆیشتن لە رێگەی سەربەخۆیی‌و رزگاری بێ‌گەڕانەوە ٠

بەرپابوونی شەڕی جیهانی دووەم‌و پاش شەڕ لە کۆتایی سالـی ١٩٣٩ بە خالێکی گۆرینکاری دادەنرێت لە مێژووی جیهاندا ٠

زۆرانبازی چەکدارانەی نێوان‌دەولەتە هاوپەیمانەکان(فەرەنسا ،ئینگلتەرە ئەمەریکا ،یەکێتی سۆڤیەت)و دەولەتە سوێندخۆرەکان (ئەلمانیا ، ئیتالیا ژاپۆن) ، وە بەشداری کردنی ڕوسیاو وولاتە یەکگرتووەکان لە شەڕدا لەگەل درێژەکێشانی شەڕ لە گشت بەشەکانی جیهاندا ،ئەمانە بوونـــە هۆی دروست بوونی هێزێکی ناوخۆیی نوێ کە یارمەتی گەلانی ژێـــر چنگی ئیمپریالیزمی‌دا بۆ بەهێزکردنی بزوتنەوە نـەتەوەیی‌یەکانیـــان ،هەروەها گەلێك ڕێبازی نـوێ بۆ بەگژاچوونی هێزی ئیمپریالیـــزم دروست‌بوو کە لەسەر بناغەو بنەمای نوێ دارێژرابـــوون ٠ باشووری رۆژهەلاتی ئاسیاش پەیدابوونی دووهێزی نوێی بەخۆیەوە بینی ،ئەویش ژاپۆنە کە لەم شەڕەوێرانکاری‌یەدا چووە پال سوێندخۆرەکان ،هەروەها چین کـە تیایـدا هێزە کـۆمۆنیستەکان‌و پێشکەوتـووخـوازەکان لـە بەربەرەکانی‌یەکی توندا بوون ٠پەیدابوونی ئەم دوو هێزە سالانی شەڕدا کارێکی گەورەی کردە سەر ژیاندنەوەی گیانی شۆرشگێری لە وولاتانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا بە شێوەیەکی گشتی‌و لـە ڤێتنـــام بـــە شێوەیەکی تایبـەتی ٠

لە کۆتایی شەڕدا هێزە ئەوروپایی‌یە کۆنەکان گەڕانەوە بۆ باشـــووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا بۆ سەتدنەوەی دەسەلاتیان ٠ وولاتە یەکگرتووەکانـــی

ئەمریكاش بە ئاراستەیەكی نوێ خۆی هەڵقورتاندە ناو مەسەلەكـــەوە ٠ئەم بەشداری كردنەی ئەم جارەی وەك ئەو بەشداری كردنە نەبـــوو كە لە بەرەنگاری كردنی فاشیستو نازی‌یەكاندا كردی ،بەڵكو ئەمجـارە ئامانجی وەستاندنی پەرەسەندنو پێشكەوتنی كۆمۆنستی‌یە هەروەك لــە زمانی دبلۆماسی‌یە ئەمریكایی‌یەكاندا هاتووە كە دەیان ووت مەبەستمان پاراستنی گەلانە لە مەترسی كۆمۆنیستی بە هەموو جۆرە هۆكارێكـــی سەربازی یان سیاسی یان ئابووری ٠

سالآنی شەڕو دوای شەڕ بە قوناغێكی گرنگ دادەنرێ لەمێژووی هیندی چینی كە تیایدا گەلی ڤێتنام ئامادەیی خۆی بۆ رزگاركردنی ووڵات ئاشكرا كرد(٩) ٠

## داگیر كردنی ژاپۆنی‌و گەشەكردنی ڤیتمنە

لە سالی ١٩٤٠ هێزی فەرەنسا بەرامبەر هێزی ئەڵمانیـــای نازی شكاو ژاپۆن توانی لە نێوان سالآنی ١٩٤٠ـ١٩٤٢ زۆر لە ناوچەكانـــی باشووری رۆهەلآتی ئاسیا كە (مەلایۆ ، سەنگافورە ، بۆرما ، ئیندونیسیا وفلبپین) دەگرێتەوە داگیر بكات ٠ هەروەها بەپێی رێكەوتنامەی تۆكیۆ

(٩) شەڕی جیهانی دووەم بە خاڵێكی گۆرانكاری گرنگ دادەنرێ لــە مێژووی گەلانی ژێر دەستە چونكە پاش شەڕی دووەمی جیهانـــی گـــەلانی ژێردەستە هوشیار بوونەوە لە زۆر راستی گـــەیشتن ، لەبەرئەوە دەستیان كرد بە خەبات كردن ، وە هەڵگرتنی چەكـــی رزگاری لەروو داگیركەراندا ،ئەوەبوو ژمارەیەكی زۆریان توانی‌یان خۆیان لە ژێر چەپۆكی خوێن مژانی جیهانی رزگار بكەن ٠ ئـــەو گەلانەی تائێستا لەژێر چنگی ئیمپریالیزم ماون بەردەوام لـــە تێكۆشاندان بۆ پاك كردنەوەی ووڵات لە ئیمپریالیزمو نۆكەرانـــی (ف٠هـ٠م) ٠

که له ئەیلولی سالی ۱۹٤۰ له نێوان ژاپۆن‌و حکومەتی فیشی مۆرکرا(۱۰) ،ژاپۆن هیندی‌چینی داگیرکردو ئاشکرای کرد که بەپێی ڕێکەوتن‌نامەکە مافی حوکم کردن‌و بەرگری کردنی له هیندی‌چینی هەیە ·

حکومەتی فیشی جەنەڕاڵ (دی‌سۆ)ی کرد به حاکمی هیندی‌چینی ،سیامی‌یەکان (تایلاندی‌یەکان) ئەمەیان به هەل‌زانی بۆ گێرانەوەی دەسەڵاتیان بەسەر لاوس‌و بەشەکانی کەمبۆدیا که ماوەی نیو سەدەیە فەرەنسا له دەستیانی کردۆتەوە ·

دوای بەستنی ڕێکەوتن‌نامەی تۆکیۆی دووەم له ئایاری سالی ۱٤۹۱دا سیام گەیشته ئامانجەکانی چونکه بەپێی ئەم ڕێکەوتن نامەیە فەرەنسا دەستی له سیام‌و بەری ڕۆژئاوای میکۆنگ‌و دوو هەرێم له هەرێمەکانی کەمبۆدیا کردەوە · هەروەها ژاپۆنیش هەلسا بەگێرانەوەی وولایەتەکانی باکووری مەلایۆ بۆ شانشینی سیام ،که ئەمەش لەکاتی ئیمپریالیزمی بەریتانیدا لێی زەوت کرابوو ·

بارودوخ بەم شێوەیە ڕۆی بەرێوە ،بەلام دوای تەواوبوونی شەڕ شێوەی سنوورەکان گەڕایەوە باری جارانیان ·

بەلام ڤێتنام به هەرسێ بەشەکەیەوە بارێکی تایبەتی وەرگرت ،ژاپۆنی‌یەکان ڕێگەی نووسینگەی فەرەنسی‌یەکانی سەر به حکومەتی فیشی‌یان دا (که ملکەچی سوێندخۆرەکان بوو) بۆ بەردەوام بوون

---

(۱۰) حکومەتی فیشی ئەو حکومەتەیە جەنەڕاڵ بیتان دروستی کرد له جێگەی حکومەتی دیگۆل ، پاش ئەوەی حکومەتی فەرەنسا له سالی ۱۹٤۰ خۆی دایە دەستەوە · ف·هـ·م

لەسەر کاروباری بەڕێوەبردنو حوکم گێڕان لە بەشەکانی ڤێتنام ،چونکە ژاپۆنییەکان تەنها بە داگیر کردنی سەربازی شوێنە ستراتیجییەکانەوە وەستان کەنزیکەی ٣٥ هەزار سەربازیان لەو ناوچانەدانا ٠

حوکمدارە فەرەنسییەکان خۆیانیان لە بارێکی زۆر شلۆقدا دەبینی چونکە مانەوەیان لەسەر کارەکەیان نابێتە هۆی لێخۆش بوونیان لــــــە بەرهەڵستی کردنیحکومەتی ژاپۆن ، لە هەمان کاتیشدا زۆر لەگەشەکردنی گیانی نەتەوایەتی دەترسان ٠ بزوتنەوەی نشتمانی ڤێتنامیش تــــەواو گەشەی کردبووو لە تێکۆشاندا بوون دژی داگیرکەری ژاپۆنی ٠کەچـــی فەرمانبەرە فەرەنسییەکان زۆر لەم بزوتنەوەیە دەترسان ،لەبەر ئــەوە هەموو توانایەکیان بۆ بەرهەڵستی کردنی ئەم گەشەکردنە خستبووە کار٠ حاکمی فەرەنسی (دیسۆ) لــە کاتــی حوکمڕانــیدا توانـــی دوو شۆڕشی کۆمۆنیستی لە کۆشینچین دامرکێنێتەوە ،ئەمەش وای لـــــە شۆڕشگێران کرد کە دەست بکەنەوە بەکاری نهێنی ٠

لە ساڵی ١٩٤١دا پارتــی کـۆمۆنیست لــە هیندیچینی بڕیـــاری دەستکاری کردنی سیاسەتی خۆیدا ،ئەویش بە دروست کردنی بەرەیەکی نشتمانی کە هەموو ئەو دەستەو تاقمانە بگرێتە خۆی کە دژی دەسەلاتـــی بێگانەن ، تەنانەت دەرەبەگەکانیش مافی چوونە ناو ئەو بەرەیەیان هەیە بەم جۆرە ئەم بەرەیە لـــە کۆنگرەیەکـی زۆر لــە رێکخـــراوو لایەنـە نشتمانییەکان لە ژێر سەرکردایەتی هۆشیمنەدا دروستبوو ،ئـــــەم کارەش دوای رێگەدانی چینلە کۆنفرانسێکی نشتمانیدا کەلە چین بەسترا بە ئەنجام گەیەنرا ٠لە کۆتایی کۆنفرانسەکە بڕیاری دروست بوونی ئـەم بەرەیەیاندا بە ناوی (بەرەی رزگاری ڤێتنام) یا (ڤێتمنە) کە کـــــورت

کراوی ناوی بەرەکەیە بە زمانی نشتمانی (ڤێتنام دوك لاب دۆنگ منـــە هـــــۆی)(١١) •

یەکێك لە ئەندامانی بەرە بە ناوی (خۆنجوین جیاب) ناردرا بۆ ڤێتنـــام بۆرێکخستنی جوولانەوەیەکی پێشرەو •جەنەراڵ جیاب لە ساڵــی ١٩٤٢دا لەگەڵ کۆمۆنیستەکانی چیندا لەناوچەی(یانات)کاری‌دەکرد کە توانی نزیکەی سەد هەزار جەنگاوەر کۆبکاتەوە(١٢) •لە دواییدا جەنەڕاڵ جیاب‌بوو(١٢) بە گەورەترین لایەنگیرو بلاوکــەرەوەی بیروڕاکانی ماوتسی تۆنـــگ دەربارەی شۆڕش •

---

(١١) پاش دروست‌بوونی ڤیت‌منە ، ئەم بەرەیە لە هەموو هەرێم‌و کونج‌و کە لەبەرێکی وولات تەشەنەی کرد • لاوان بەکوڕو کچەوە دەچوونە ناوی‌یەوە • شانەکانی بەرەبەرە لە بەڕێوبەرایەتی‌یەکــانــی وولات بەڕێژەی لەسەدا سەد بلاوبۆوە بەجۆرێك وای لێ هاتبوو کە هەموو کاروبارێکی وولات ئەندامانی ڤیت‌منە دەستیان بەسەردا گرتبوو • بەلام لەبارەی رۆژنامەوە ، هۆشی منە بڕیاری دەرکردنی رۆژنامەیەکی هەفتانەی دەرکرد بەناوی (فیات لاب) واتە (ڤێتنامی ئازاد) •ف•ه•م

(١٢) لە گرنگترین ئەو گیروگرفتانەی کە ڕووبەڕووی شۆڕشی ڤێتنـام بووەو گیروگرفتی پەیداکردنی چــەكو ئازووقە بــوو • هـــــەر خەبات‌گێرێ خۆی بەرپرسیاری پەیداکردنی چەکەکەی خـــــۆی بوو ، ئیتر چەکەکە هەر چۆنێك بێ گرنگ نیە (شمشێر ، خەنجەر تفەنگی ڕاو ، بارود ••هتد) • لە هەندێك ناوچەدا میللەتەکە پارەیان کۆدەکردەوەو لە وولاتی چین تفەنگیان پێ دەکڕی •
دەبوایە هەر خەبات‌گێرێك گوریسێکی لەگەڵ خۆیدا هەلبگرتایـــە بۆ مەشق کردن لەسەر راوکردنی خائینان •
لیژنەی بالای بەرە بڕیاری بنیان‌نانی کارگەیەکی دەرکرد بـــــۆ دروست کردنی نارنجۆکی دەستی‌و لوغم • ئەم کارگەیە پێنـــــچ تا شەش کرێکار ئیشیان تێدا دەکرد • ئەم کارگەیە دوای شۆڕشی ئاب فراوانی تێ‌کەوت ،وە توانی خزمەتێکی باشی شۆڕشی ڤێتنامی بکـــــات • ف • ه • م

(١٣) جەنەڕاڵ جیاب ئەو جەنەڕالە سەربازی‌یە ڤێتنامی‌یەیە کە توانـــی شۆڕشی گەلی ڤێتنام بەرەو سەرکەوتن بەرێت •

ژاپۆنی‌یەکان زۆر بە هەڵە تێگەیشتبوون کاتێك کە ویستیـــــان ڤیتمنە بکەن بە داردەستێك بۆ دەست بەسەراگـــــرتنی ڤێتنـــام ،وە بەکار هێنانیان بۆ خزمەتـی بەرژەوەندی سیاسەتـی ژاپۆنی‌یەکـــــان بەڵام ئەوەی روویدا پێچەوانەی بیرکردنەوەیان بوو چونکە ڤیتمنـــــە چەند نوێنەرێکی خۆی بۆ وولاتە یەکگرتووەکان نارد بۆ داواکردنـــــی یارمەتی سەربازی ،ئەمریکاش داواکەیانی وەرگرت ٠بەم جۆرە بەهـــۆی یارمەتی‌یەکانی ئەمریکا ،ڤیتمنە بەرهەڵستی داگیرکەری ژاپۆنی کـــردو توانی‌یان دەست بەسەر زۆربەی تۆنکین‌دا بگرن ٥ بەم شێوەیە هۆشی‌منە لە سەرەتادا یارمەتی ئەمریکاو لایەنگیری چینی نشتمانی دژی داگیرکەری ژاپۆنی بەکارهێنا ٠

---

☜ ئەم جەنەڕاڵە هەر لە چواردە سالی‌یەوە بوو بە ئەندام لە رێکخراوە شۆرشگێرە نهێنی‌یەکان ٠ پێش هەڵگیرسانـی شەڕی دووەمـــــی جیهانی کاری شۆڕشگێری ناچاری کرد کە لە چیندا نیشتەجێ بێ ، لەو ماوەیەدا کە لە ڤێتنام دوورکەوتبۆوە حکومـەت خێـــزان‌و کوڕەکەی لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا کوشت ، هـەروەها بـــرای خێزانەکەشی لە سێدارە دا ٠

ئەم جەنەڕاڵە هیچ کاتێك شەڕی بە پیشەی خۆی نەئەزانی ، بەڵکو زۆر خولیای ئاشتی بوو منالی خۆش دەوویست ، مرۆڤێکـی زۆر هێمن‌و ساردو سڕ بوو ، هەر لەبەر ئەمەش هۆشی‌منە پێی دەووت :ــ بەفرو بورکانی لەیەك کاتـــــدا ٠

جەنەڕال جیاب بڕوانامەی لیسانسی لە زانکۆی هانۆی لە سالی١٩٣٧ وەرگرتووە ، هەروەها لە سالی ١٩٣٩ دکتۆرای لە زانستەکانـــی ئابووری‌دا هێناوە ، سەرەڕای ئەمانەشـ زۆر لەزانستی مێـژووی سەربازی‌دا (علم التاريخ العسكري) شارەزابوو بە جۆرێك کـــــە قوتابیە هاورێکانی دەگێڕنەوە کـــە ئەیتوانـی لەسەر تەختـــە زۆر بەووردی وێنەو نەخشەی هەموو پیلانەکانی شەڕی ناپلیۆن بکێشێ و ٠ هـ ٠ م

## ئاشکراکردنی سەربەخۆیی

لە سالی ١٩٤٤دا فەرەنسی‌یەکان بە یارمەتی هاوپەیمانـە ئەمریکایی‌یەکان توانیان دابەزنە کەنارەکانی ڤێتنام ٠

ژاپۆن ترسی مانەوەی فەرەنسی‌یەکانی لە مەڵبەندەکانی بەڕێوەبردن‌و حوکمکردندا لێ‌نیشت ،لەبەر ئەوە بریاری گرتنی هەموو ئەو فەرەنسی‌یانە درا کە لە ڤێتنامدا بوون ،وە ڕێکەوتن‌نامەی تۆکیۆی سالی ١٩٤٠یان هەڵوەشاندەوەو ئیمپریالیزمی فەرەنسی لە هیندی‌چینی کۆتایی هات ٠پاش دوورخستنەوەی فەرەنسی‌یەکان ،ڤیت‌منە بووە تاقە لایەن کە سەرکردایەتی سیاسی‌و بەرهەڵستی‌کردنی ژاپۆن بگرێتە ئەستۆ ٠ لە مارتی سالی ١٩٤٥ ژاپۆنی‌یەکان توانیان بە تەواوی سەرببکەون بەسەر سەربازگە فەرەنسی‌یەکان‌و نەیانهێڵن ٠

لەسەر شانۆی ڕووداوەکانی ڤێتنام جگە لە هۆشی‌منە یەکێکی تریش هەڵکەوت ئەویش ئیمپراتۆریەتی ئەنامی خانەنیشن (باودای) بوو ٠لە سالی ١٩٤٥ ژاپۆنی‌یەکان ویستیان لە کاروباریان بەکاری بهێنن ،بۆ ئەم مەبەستە داوایان لێ‌کرد کە جاری سەربەخۆیی بدات ٠ئەویش بە ناچاری ئەمەی کرد ٠

کۆمۆنیستەکان‌و نەتەوەیی‌یەکان دانیان بە حکومەتەکەی باودای بەکرێ‌گیراودا نەنا ٠

کاتێك وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆمبا ئەتۆمی‌یەکـــەی خۆی هاویشتە سەر هیرۆشیما(١٤) ،جیهان لە کۆتایی شەڕ نزیك ئەبۆوە ٠لە ٧ی ئابی سالی ١٩٤٥ هۆشی‌منە بڕیاری دروستبوونــی لیژنــــەی رزگاری میللی ڤێتنامی دەرکرد ،وە هەر خۆشی سەرۆکایەتی‌یەکەی بە دەستەوەگـــرت ٠

---

(١٤) لە مانگی ئابی سالی ١٩٣٩ زانای فیزیاوی بەناوبانگ ئەلبێرت ئەنشتاین بۆ سەرۆکی ئەمریکا (رۆزفلت)ی نووسی کە بەپارچــە کردنی ئەتۆم هێزێك پەیدا ئەبێت کە توانای لەهەوو بۆمباکـــان زیاترە بۆ وێرانکــــاری ٠
ئەوەبوو بۆ یەکەمین جار ئەم بیرە ئاخنرایە مێشکی ئەم خوێـــن رێژەوە ٠ لە ئەنجامدا بەشێوەیەکی نهێنی‌و دوای پێنج سال کارکردن کە ١٢٥ هەزار مرۆڤ لە ئەمریکا بەشداریان تیاکرد بۆمبای ئەتۆم هاتە کایەوە کە دوو ملیۆن دۆلاری تێچـــوو ٠
لە ٢٦ی تەمموزی سالی ١٩٤٥ دا سەرۆك ترۆمان بانگەوازێکــی بۆ گەلی ژاپۆن نارد کە بەبانگەوازی پۆتسدام ناسرابوو ، تیایــدا داوای خۆ بەدەست دانەوەی هێزی ژاپۆنی کرد بێ ئەوەی‌دەست بۆ ووشەی بۆمبای ئەتۆمی رابکێشێ ٠ ژاپۆن بەم بانگەوازە قایل بــوو ،بەلام زیاتر چاوەڕوانی ووتووێژێکیان بوو کە یەکێتی سۆڤیــەت ببێ بە ناوەند لە ووتووێژەکە ٠ هێشتا هیچ وەلامێکی رەسمی لەلایەن ژاپۆنــەوە دەرنەچووبــوو ، ئــەمریکــا خوێنمژی گــەلان بڕیاری تاقی‌کردنەوەی بۆمبا ئەتۆمی‌یەکەیانیان دەرکــرد ٠
لە ٣ی ئابی ١٩٤٥ ئەم بڕیارە دوور لە مرۆڤایــەتی‌یە دەرچــوو و شاری هیرۆشیما وێران کرا ، لە ماوەی چەند چرکــەیەکــــدا هەزاران کەس سووتێنرا،زۆربەی دانیشتوانکوژران‌وبریندار بوون ، چەند کەسانێکی کەم نەبێ خۆیان شاردەوەو روویان لـــــە پەناگەکان کرد بەلام ئەوانیش پاشــ بیست سی رۆژ لەبـــــەر ئازاری تیشکی گامای کوشندە چاویان لێکنا ٠
پاش دوو رۆژ لەم کارەساتە جەرگبڕە بالوێزی ژاپۆن داوای لــە یەکێتی سۆڤیەت کرد بۆ ئەوەی ببێ بە ناوەندێکی ووتووێژ ٠
لە کاتێکدا ئەنجوومەنی بەرزی بەرگری ژاپۆن بەندە کانی بانگەوازی پۆتسدامی لێك ئەدایەوە ، لە رۆژی ٩ی ئابی هەمان سالو لە =

له هه‌مان کاتداو له‌رۆژی ٨ی ئابدا ئیمپراتۆر باودای بانگه‌وازێکـی باودای بانگه‌وازێکی بۆ جه‌نه‌راڵ دیگۆڵ نارد ،تیایدا ئاشکرای کـــرد که گه‌لی ڤیێتنام به مانه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵاتی بێگانه رازی نیه ٠به‌ڵام دیگۆڵ هیچ بایه‌خێکی به بانگه‌وازه‌که نه‌دا چونکه شتێکی زۆر که‌می ده‌رباره‌ی ڤیێتنام ده‌زانی‌و هه‌موو توانایه‌کی بۆ گێرانه‌وه‌ی حوکمی فه‌ره‌نسا خستبووه کار٠

له قۆناغی یه‌که‌می خه‌باتدا هۆشی‌منه داوای یارمه‌تی له ئه‌مریکـــا ده‌کردو متمانه‌ی ده‌کرده سه‌ر لایه‌نگیری چین ،به‌ڵام له‌م قۆناغه‌ی دواییدا خۆی ئاماده کردبوو بۆ به‌رپاکردنی خه‌باتی میللی‌و سوود وه‌رگرتن لـه‌و باره‌ی باودای تیایه‌تی ٠ئه‌م هه‌نگاوه‌ی هۆشی‌منه یه حیکمه‌یه‌کی سیاسی زۆر به‌هێز داده‌نرێ چونکه باودای لای هه‌ندێ له خێڵه ڤیێتنامی‌یه‌کـــان خاوه‌نی لایه‌نگیری‌یه‌کی زۆر بـــــوو ٠

له ٢٨ی ئابدا هۆشی‌منه بڕیاری هه‌ڵوه‌شاندوه‌ی لیژنه‌ی رزگـاری میللی ده‌رکرد ،وه حکومه‌تێکی نشتمانی نوێی دامه‌زراند کـه خـــۆی سه‌رکردایه‌تی کردو باودای کرد به راوێژکاری به‌رزی ئه‌م حکوومه‌تـــه ،وه زۆربه‌ی وه‌زیره کانی له کومۆنیسته‌کان بـــوون ٠

بۆ پاراستنی هه‌ڵوێستی خۆی‌و پشتگیری کردنی بڕیاره‌که‌ی پشتی به بانگه‌وازی فه‌ره‌نسی بۆ مافـی مرۆڤ‌و بانگـه‌وازی ئه‌مریکا بـــــۆ

---

= کاتژمێری یانزه‌ی سه‌ر له‌به‌یانی‌دا بێ به‌زه‌یی‌یه‌کانی واشنتـــۆن بۆمبایه‌کی تریان هه‌ڵدایه ناو نشاری ناگازاکی ، به‌ڵام ئه‌نجـــامی وێرانکاری ئه‌م بۆمبایه‌ی دوایی که‌متر بوو له‌هی پێشوو ، سه‌ره‌ڕای ئه‌مه‌ش ژماره‌ی به‌رکه‌وتووان گه‌یشته ٧٣٨٨٤ کوژراوو ٦٠ هه‌زار پرینـــدار ٠ ف ٠ هـ ٠ م

مسۆگەرکردنی سەربەخۆیی دەولـەتان بەست ،وە هیچ پـەنجەی بـــۆ بەیاننامەی کۆمۆنیست رانەکێشا • بەم شێوەیە حکومەتی ڤێتنامی نوێی سەربەخۆ دامەزرا دوای ئەوەی باوداى وازی لە کورسی خۆی هێنـــــاو بوو بە راوێژکاری بەرزی حکومەتی نوێ • بەلام فەرەنساو هاوپەیمانەکانی دانیان بەم سەربەخۆیی‌یەدا نـــەنا •

لە هامان سالدا جەنەرال دیگۆل یەکێتی فەرەنسای ئاشکرا کرد کە لە فەرەنساو مولکەکانی‌و موستەعمەرەکانی لە پشت دەریاوە (فیمـا وراء البحار) پێك هاتووە کە هیندی‌چینیش یەکێك بوو لەو شوێنانە •

گەلی دلێری ڤێتنامیش بەرهەلستی ئەم پرۆژە گلاوەیان کـــــردو سووربوون لەسەر پتەوکردنی بناغەی کۆمارە خۆشەویستەکەیان •لــە کاتێکا حکومەتی هۆشی‌منە گەشەی بەم سەربەخۆیی‌یە دەدا ،رێکەوتن‌نامەی پۆتسدام بەسترا بەبێ ئەوەی فەرەنسا ئامادەبووبــێ•بەپێی ئــــەم رێکەوتن‌نامەیە پێویستە لەسەر حکومەتی چینی نشتمانی تا هێلی پانـی ١٦ بەرەو باکوور لە هیندی‌چینی داگیر بکات ،وە ئینگلتـەرەش دەبێـت دەست بەسەر باشووری هێلەکەدا بگرێت •

## چاووڕاوە سیاسی‌یە سەرەتایی‌یەکـــان

پاش بۆمباکەی هیرۆشیما هەولی دووبارە داگیرکـردنەوەی ڤێتنـام درا ، ئەمەش بە چەند چاووڕاوێکی سیاسی‌یەوە بەسترابوو ،کە لــــەم چەند خالانەی خوارەوە کورتیان دەکەینەوە :ــ

١ ــ ئارەزووی بەتینی فەرەنسا لە گێرانەوەی دەسەلاتی لە ڤێتنـامو بەشەکانی تری هیندی‌چینی‌و جێبەجێ‌کردنی بڕیارەکانی کـۆنفرانســی

(برازافیل)ی ساڵی ١٩٤٤ کە لەو کۆنفرانسەدا دامەزراندنی کـــــۆماری فەرەنسای چوارەم لەسەر شێوەی یەکێتی فەرەنسی ئاشکراکرا ،ئـــــەم کۆمارەش لە فەرەنساو گشت موستەعمەرەکانی پشت دەریا دەگرێتـــەوە ٠

٢ ـ لایەنگیری کردنی فەرەنسا لەلایەن ئینگلتەرەوە بۆ گێـــڕانەوەی پایەی لە ڕۆژهەڵاتی دووردا ٠

١ ـ ڕێبازێکی ئەمریکی تەقەڵلای دوور خستنەوەی فەرەنسای لە ناوچەکـــە دەدا ٠ لە ساڵی ١٩٤٥ ڕووداوەکان بە شێوەیەکی خێرا پەرەیان سەنـــد ،چینی نشتمانی باکووری ڤێتنامی داگیرکرد ٠ هۆشەمنەش ئــــــــەمەی بە هەل زانی بۆ بەهێزکردنی ڤیتمنە بەهۆی یارمەتـــی چینی یەکـــانەوە ،وەکو قۆناغێك بۆ بەدیهێنانی سەربەخـــۆیی و ڕزگـــاربوون لە چنـــگ داگیرکەری ژاپۆنی ٠ بەڵام بەریتانیا دەیوایە بە هاوبەشی لەگـــــــەڵ فەرەنسا بـــەشی باشوور داگیربکـــات داوای هاتنەوەی دەسەڵاتـــــــی فەرەنسای بۆ ناوچەکە دەکرد ٠ لە هەفتەی یەکەمی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٥ هێزێکی گەورەی بەریتانـــی و هیندی لەژێـــر سەرکـــردایەتی (دۆگلاســـس جریسبی)لە سایگۆن دابەزی ،بەڵام هێزەکانی فەرەنسا دواکەوتن و لـــە ٣ی ئۆکتۆبەر گەیشتنەجێ ،سەرنجیاندا بار زۆر شێواوە چونکە ڤیتمنە ئەنجوومەنێکی ڕاپەراندنی دامەزراندووەو سەربەخۆیی ڕاگەیاندووە٠هێزی بەریتانیاش توانیویانە ژاپۆن دەربکەن و دیلە فەرەنسییەکان ئازاد بکـــەن ،وە لە دژی ڤیتمنە چەکداریان کردن کە لە ئەنجامدا خـــۆیان تووشــــــی زیانێکی گەورە کــــــرد ٠

کار لە ڕووی سیاسەتی فەرەنسا زیاتر ئاڵۆز بوو چونکە لـــــــــە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ ڤیتمنە هەڵبژاردنێکی گشتی سازدابووە لە ئەنجامدا هۆشی منە کرا بە سەرۆکی حکومەت ٠لەبەر ئەوە فەرەنســـا

شان‌بەشانی سیاسەتی گێرانەوەی دەسەلاتی سەربازی پەنای بـــۆ سیاسەتی هودنەی کاتی بــــرد ٠

لە مارتی هەمان سالدا هۆشی‌منە کەوتە ووتوویژ لەگەل فەرەنسا بە سەرۆکایەتی (سانتینی) کە لە ئەنجامدا ریکەوتن‌نامەیەکیان مۆرکــرد ،بە پێی ئەم ریکەوتن‌نامە :ـ

فەرەنسا دان بە رزگاری ڤێتنامدا دەنێت وەکو یەکەیەك (وحـدة) لە یەکێتی هیندی‌چینی فیدرالی ،دان نان بە ئۆتۆنۆمی ڤێتنام لە ژێــر سێبەری یەکێتی فەرەنسا ،هێزی فەرەنسی دەتوانێت لە باکووردا جێگەی هێزی چینی نشتمانی بگرێتەوە ٠

هۆشی منە لەبەر دوو هۆی سەرەکی بەم ریکەوتن‌نامەیە قایل بوو :ـ

١ ـ رزگاربوون لە هێزی چینی

٢ ـ دەرك‌کردن بەوەی کە ڤیت‌منە لـەو کاتەدا نـەی ئەتوانـــی رووبەرووی سوپای بە هێزی فەرەنسا ببێتەوە ، کە یارمەتی‌یەکی زۆری لە وولاتە رۆژئاوایی‌یەکانەوە بۆ دێت ٠

لە سەر ئەم بناغەیە ڤیت‌منە سیاسەتێکی نوێی گرتەبەر کە بریتی‌یە لە خەباتی بەردەوام و درێژخایەن تا جێ‌بەجێ‌کردنـی یەکێتی‌و رزگـاری وولات ٠

بە تێپەربوونی چەند مانگێکی سالی ١٩٤٦ بەربەرەکانی‌یەکـــی گەورە لە نێوان حکومەتی کۆماری ڤێتنام بە سەرۆکایەتی هۆشی‌منــە

له لایه‌كو مه‌ندوبی سامی حكومه‌تی فه‌ره‌نساو هێزه چه‌كداره‌كانی له‌لایه‌كی تره‌وه به‌دیاركه‌وتن .

ئامانجی حكومه‌تی ڤیێتنام یه‌كخستنه‌وه‌ی هه‌ر سێ به‌شه‌كه‌ی ڤیێتنام (تۆنكین ، ئه‌نام، كۆشین‌چین) بوو . به‌لام فه‌ره‌نسی‌یه‌كان كۆشین‌چینیان به ناوچه‌یه‌كی داگیركراوی فه‌ره‌نسی دائه‌نا ، ئه‌نام و تۆنكینیش به (محمیات)ی فه‌ره‌نسی‌یان ده‌ژمارد .فه‌ره‌نسا ده‌ستی كرد به‌كار بۆ جیاكردنه‌وه‌ی كۆشین‌چین و كردنی به ناوچه‌یه‌كی حوكمی سه‌ربازی ئه‌ویش به لێدانی به تینی لایه‌نه به‌ربه‌ره‌كانی كه‌ره‌كان . وتوویژ له نێوان نوێنه‌ری هۆشی‌منه‌و نوێنه‌ری حكومه‌تی فه‌ره‌نسا به‌رده‌وام بوو به مه‌به‌ستی جێبه‌جێ‌كردنی به‌نده‌كانی په‌یماننامه‌ی مارت . به‌لام ئه‌مجاره وتوویژ بۆ یه‌كجاری سه‌رنه‌كه‌وت به‌هۆی سووربوونی حكوومه‌تی ڤیێت‌منه له‌سه‌ر سه‌ربه‌خۆیی و یه‌كێتی ڤیێتنام ،وه سووربوونی فه‌ره‌نساش له‌سه‌ر جیاكردنه‌وه‌ی كۆشین‌چین و سه‌ربه‌خۆیی ڤیێتنام له‌ژێر سێبه‌ری یه‌كێتی فه‌ره‌نساو یه‌كێتی هیندی‌چینی . به‌دوای ئه‌م سه‌رنه‌كه‌وتنه فه‌ره‌نسی‌یه‌كان ده‌ستیان كرد به هێرش بردنه سه‌ر نشتمانپه‌روه‌ران له رۆژی ١٩ی كانوونی یه‌كه‌می سالی ١٩٤٦ گولله‌بارانی كۆمه‌لێك ڤیێتنامی كردله هانۆی ،كه له ئه‌نجامدا ژماره‌ی كوژراوان و بریندارانی گه‌یشته نزیكه‌ی شه‌ش هه‌زار كه‌س له رۆژی دوای كاره‌سا ته‌كه هۆشی‌منه بانگه‌وازی بۆ فه‌ره‌نسا ده‌ركردو ئاماده‌یی گه‌لی ڤیێتنامی بۆ ئاشتی ده‌ربری .فه‌ره‌نساش پێشنیازی ڤیێت‌منه‌ی به به‌ستنی هودنه قه‌بوول كرد .له رۆژی ١١ی ئایاری سالی ١٩٤٧ مه‌ندوبی فه‌ره‌نسا (بۆل موسی) په‌یوه‌ندی هۆشی‌منه‌وه كردو ئه‌م چوار مه‌رجه‌ی خسته روو :ـ

١ ـ چەك داماڵینی هێزی چەكداری ڤیێتنامی ٠

٢ ـ هێزەكانی فەرەنسا لە هەر لایەكی ڤیێتنام مافی هاتووچۆیان هەیـــــە ٠

٣ ـ بەرەڵلاكردنی سەربازە دیلە فەرەنسی‌یەكان‌و بێگانەكان٠

٤ ـ بەرەڵلاكردنی هەموو گیراوە مەدەنی‌یە فەرەنسی‌یەكان‌و ئـــــەو ڤیێتنامی‌یانەی كە لایەنگیریانن ٠

دیسانەوە وتووێژ نەگەیشتە ئەنجامەكانی بـــەهۆی سووربوونـــی فەرەنسا لەسەر مەرجەكانـــی ٠

بەم‌جۆرە هەموو هەوڵدانەكانی حكومەتی فەرەنســا بۆ گێــرانەوەی دەسەڵاتی پێشێل بــــوو ٠

هەر لە قەسابخانەكەی هانۆی رۆژی ١٩ی كانوونی یەكەمەوە دەستی كرد بە پەیرەوی‌كردنی سیاسەتێكـی نـوێ ئەویش بـە گێرانـەوەی دەسەڵاتیەتی بەو هێزەی هەیەتی ،بەڵام دەبێت بۆ فەرەنسا روون بێ كـە ئەم سیاسەتەش رووبەرووی ئەو بەرگری‌یە میللی‌یە دەبێتەوە كـــــــە ئالای خەباتی درێژخایەنی هەڵگرتووە بۆ پاككـردنەوەی وولات لــــــە ئیمپریالیزم‌و نۆكەرەكانی ،وە گەیشتن بە سەربەخۆیی‌و یەكێتی ٠

# خەباتی یەکـــەم

هەر لەو کاتەوەی گەلی ڤیێتنام بۆی دەرکەوت کە فەرنسا دان بـــە داواکاری‌یەکانی نانێت لە سەربەخۆیی‌و یەکێتی ڤیێتنام بۆیان زوون بووە کە خەبات تاقە ڕێگەیە لە پێشیاندا ٠

هەرچەندە لە پێش ساڵی ١٩٤٧ هەندێك شەڕو شۆڕ هەڵگیرسا ،بەڵام ڕۆژی ٢٢ی کانوونی یەکەم بە ڕۆژێکی پڕشنگدار دادەنرێ لـــە مێژووی ئەم خەباتە کە بە قەسابخانەکەی هانۆی دەستی پێ کـــرد ٠

## پاڵ پێوەنەرەکانی خەبات

هەر لە ڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماری فەرەنسای چوارەم‌و دامەزراندنی یەکێتی فەرەنسا ،فەرەنسا وەکو موستەعمەرەیەك سەیری ڤیێتنامی دەکرد کە دەبێت مل کەچی ڕژێمی نوێی فەرەنســا بکات ٠لـــە ساڵـــی ١٩٤٦ جەنەڕاڵ دیگۆل ئارەزووی گێرانەوەی ئەو نەمری‌یەی‌دا کە ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا لە پێش شەڕدا هەیبوو ،هەروەها سوور بوو لەسەر پاشکۆیەتی (تبعیة) ڤیێتنام ئەگەر بە زۆریش بێت ٠

لەپاڵ ئەم هۆیە سیاسی‌یەوە هۆیەکی تریش هەبوو کە ئەویشـــ ئابووری‌یە ٠هەر لە ڕۆژی داگیرکردنی ڤیێتنامەوە ویستیان سەرمایەداری فەرەنسی دەست بەسەر وولاتدا بگرێت ،بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٣٩دا ٩٧٪ی سەرمایەی بەکارهێنراو (مستثمرة)ی کۆمپانیاکانی چاککـــردن‌و بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی لە ڤیێتنام سەرمایەی فەرەنسی بوو ،سەرمایەی بێگانەی تری وەك ئینگلیزو ئەمریکا گەیشتبووە ٢٪ ،ئەوەی دەمێنێتـــەوە دەکاتە ١٪ سەرمایەی نشتمانی ڤیێتنام بـــوو ٠ژمـــارەی ئەو دەستـــە فەرەنسی‌یانەی لە مەیدانی بازرگانی ناوخۆدا کاریان دەکرد ٧٩ دەستـــە

بوون کە سەرمایەکەیان خۆی لە ٢٥ ملیار فرەنك دەدات٠ هەروەهـــا فەرەنسی یەکان دەستیان گرتبوو بەسەر بازرگانی بەرهەمە سەرەکی یەکانی وەك برنج و گەنمەشامیو رۆن کە ٨٨٪ی نێرراوەکانی (صادرات) ســـالی ١٩٣٨ ی ڤیتنام بوو ٠جگە لەمانە ڤیتنـــام کرابووە بازارێك بـــۆ ساغ کردنەوەی کەلوپەلی بەرهەمهێنراوی فەرەنسا ،بۆ نموونە ڤیتنـــام ٨٩٪ی پێویستی یەکانی لە چنراوە لۆکەیی یەکانیو ٩٤٪ی جلوبەرگـــی دووراو ، ٧٧٪ی ئۆتۆمبیلو پێـــداویستی بەکانـــیو ٩٢٪ی ئامێـــرە دروستکراوەکانی لە فەرەنسای دەکڕی ٠ئەم شتانە لە بازاڕی ڤیتنـــام بە زیاتر ١٥٪ی نرخی بنەڕەتی خۆی دەفرۆشرا ٠

ئەو سوود وەرگرتنە گەورەیەی فەرەنسا لە ئابووری ڤیتنامـــــدا دەستی دەکەوت پاڵی پێوەنا کە جارێکی تر دەست بەسەر خاکی ڤیتنامـــدا بگرێت بۆ بەکارهێنانی سامانەکەی لە ئابووری فەرەنســـادا ٠

سەرەڕای ئەم هۆیانەی باسمان کردن هۆی تریش هەبوو هـــانی فەرەنسای دەدا بۆ دووبارە داگیرکردنەوەی ڤیتنام ،لەوانە یارمەتیدانـــی فەرەنسا بوو بە ماڵو چەکی جەنگی لە لایەن ئەمریکاوە بۆ بەردەوام بوون لەسەر ڕێگەکەی بێگومان مەبەستی ئەمریکا لێرەدا بەرهەڵستیکردنـــی بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیستی بوو ٠

گەلی ڤیتنامیش سەربەخۆییو رزگار بوون لە چنگی سەرمایەداری بێگانەی کردە تاقە ئامانجی خۆیو ڕێگای خەباتی درێژخایەنی گرتەبـــەر ،وە هەموو هێزەکانی گەل بە دەوری ئەم خەباتەدا گـــــۆبوونـــەوە بۆ خۆئامادەکرن بۆ شەڕی ژیان یان مـــردن ٠وە نەبێت ئەمە یەکـــــەم تاقی کردنەوەی گەلی ڤیتنام بێ ،بەڵکو بە درێژایی مێژوو بەرهەڵستـــــی

هەموو هێزێکی بێگانەی کردووە ٠ رووبەرووی چینودەرەبەگە کـــان وەستاوە سەرەرای ئەو هێـــزو دەسەڵاتـەی هـەیان بـووە ٠ لە رووی ئیمپریالیزمی فەرەنسی وەستاوە هەرچەندە خاوەنی چەکو تفـــاقـی زۆر بووە ،شەڕی ژاپۆنی کردووەو چۆکی دانەداوەو ملکەچی نەبووە ٠

ئێستاش هیچ شتێکی نوێ نیە بچێتە ناو کۆڕی خەباتێکی نـوێوە ،گەل هوشیاربۆتەوەو فێری ووشەی پیرۆزی دیموکراتیو سۆشیالیستـی یەکسانیو مافی چارەنووس بـــووە ٠

بێگومان هۆی سیاسیو مەعنەوی زیاتر لـە ئارەزووکردن بـــۆ رزگاری ئابووری وولات پاڵی بە گەلەوە نا بۆ تێکۆشان(١٥)٠

## قۆناغەکانی خەبات

هەر لە رۆژی ٢٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ەوە گەلی ڤێتنـام بەردەوامو بەبێ وەستان وولاتی لە ئیمپریالیزمی فەرەنسی پاکدەکـردەوە تا ئەوەبوو لە ٦ی ئایاری ساڵی ١٩٥٤ گـەورەترین پایـەگای فەرەنسی بە ناوی (دیان بیان فۆ) شکێنرا ٠ ئەم ماوەیە بە سێ قۆناغی سەرەکیـدا تێپەڕ بـــوو :ـ

---

(١٥) شتێکی ئاشکرایە کە لە هەموو شۆڕشە نەتەوەییەکاندا هـــۆی مەعنەوی هۆی سەرەکی شۆرشە نەك ئابووری ، چونکە گەل لـــەم جۆرە شۆرشەدا کاتێك رادەپەرێ کە هەست بە چەوساندنـەوەی نەتەوایەتی دەکات ، زمانەکەی قەدەغە دەکرێت ، هەست بـــە بوونی رژێمێکی شۆڤێنیو فاشیست ئەکات ٠
لەم کاتەدا باری ئابووری ئەو میللەتە هەرچەندە باش بێ شۆرشـی هەر هەڵدەگیرسێت ٠ ف٠هـ٠م

قۆناغی یەکەم : ئەم قۆناغە لە ٢٢ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ کە خەباتی تیا دەست پێکرا تا ساڵی ١٩٤٩ی خایاند ٠

ئەوەی لەم سێ ساڵەدا بە ئەنجام گەیەنرا بریتی بوو لە بنیات نانی هێزی سەربازیو جێبەجێ کردنە یەکێتی گەلو سوپا لە مەیدانی خەباتدا ،هەروەها سوود وەرگرتن لە تاقیکردنەوەکانی شەڕ ٠جەنەڕاڵ جیـــاب کە گەورەترین جەنەڕاڵی ڤێتنامی‌یە دەستی کرد بە کۆکردنەوەی هێزێکی سەربازی کە ژمارەیان ئەگەیشتە دە هەزار چەکدارو لە تۆنکین مەشقیان دەکرد ٠ئەم سوپایە دەستی کرد بە پەلاماردانو هێرش بردنە ســـەر هێزی فەرەنسی ،بەڵام لەم شەڕەدا زیانێکی زۆر بەهێزی گەل کەوت کـە هەرگیز چاوەڕوانی نەئەکرا ٠لەبەرئەوە جەنەڕاڵ جیاب دووبارە دەستـی کردەوە بە کۆکردنەوەی هێزەکانی لە ناوچە شاخاوی‌یەکان بۆ مـــەشق پێکردنیانو ئامادەکردنیان لە ڕووی مەعنەوی‌و فیکری‌یەوە ٠

ئەو شەڕانەی لەم قۆناغەدا دەکران زۆر دیاری کــراو بوون ،وە خۆئامادەکردن بوو بۆ قۆناغی دووەم ٠

قۆناغی دووەم (١٩٥٠- ١٩٥٣) :- ئەم قۆناغە گەلێك جووڵانەوەی مەزنی ڤیتمنەی بەخۆیەوە بینی ٠لە سیفەتەکانی ئەم قۆناغە ئەمانەن :-

١ - گەیشتنی ماوتسی تۆنگ لە ساڵی ١٩٤٩ بۆ سنووری تۆنکین کە بووە پاڵپشتێك بۆ ڤیتمنە کە پەنای بۆ بەرنو کۆمەکی سەربازی لـێ وەرگـــــرن ٠

٢ - سەرکەوتنی جووڵانەوەی ڤیتمنە لە دەست بەسەراگرتنی لادێو زۆربەی شارەکان دەست بەسەراگرتنێکی سیاسی بە تایبەتی ناوچەکانـی ناوەراستو ناوچەکانی کۆشینچین لە باشوور ٠

٣ ـ بە درێژایی ناوچەکانی سنوور فەرەنسا سیاسەتی (خۆقایمکردن لە پشت شوورەکان)ەوەی گرتەبەر ،وە دەستیکرد بە دانانی بنکەی سەربازی لە هەر یەکە لە (لاوکای ، هاچیانگ ، کاوبانگ لانگسوون ، سوونکان ، هاوینە) ٠

٤ ـ دوای ئەوەی فەرەنسییەکان مەودای پشتگیری کردنی گەلیان بۆ ڤیتمنەو گردبوونەوەیان بە دەوری هۆشیمنە بۆ دەرکەوت چاووڕاوێکی (مناورة) نوێیان گرتەبەر ،ئەویش داوایان لە باودای (ئیمپراتۆریەتی ئەنامی خانەنشین) کرد کە لە سایگۆن بە ئیمپراتۆر دایمەزرێنێ تاوەکو ببێت بە بەربەرەکانیکەرێك بۆ کۆماری ڤێتنام کە هۆشیمنە سەرۆکایەتی دەکات ،چونکە وایان باوەڕ دەکرد کە گەلی ڤێتنام لە دەوری باودای کۆدەبنەوەو هێزی میللی ڕوو لە کزی نەکات ٠بەلام ئەنجامی ئەم چاووڕاوەشی لە جێبەجێکردنی نیازەکەی پێشێل بوو ٠

٥ ـ جۆرێك لە شەڕی سارد یان شەڕەقسە لەسەر گیروگرفتی ڤێتنام سەری هەڵدا ٠وولاتە سۆشیالیستەکان لە پێشیانەوە روسیاو چینو یۆغۆسلاڤیا لایەنی حکومەتی ڤیتمنەیان دەگرت ،ئەمریکاو وولاتانی رۆژئاوای سەرمایەداریش لایەنی حکومەتی ڤێتنامی مەرکەزییان دەگرت کە فەرەنسا لە سایگۆن دایمەزراندووە ،بەلام ئەویش هیچی لە رێرەوی خەبات نەگۆڕی ٠

لەم قۆناغەدا جەنگ بەم شێوەیە دەڕۆی بەرێوە :ـ

١ ـ جەنەڕاڵ جیاب فەرمانی لێدانی ڕاستەوخۆی بە سوپای ڤیتمنە نەدا تا وەکو ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٥٠ کە خۆیو سوپاکەی

توانیان بنکەی فەرەنسی یەکان پەکخەنو دەستیان بەسەردا بگـرن ٠ لە ئەنجامی ئەو شەڕە زۆرانەی روویدا کە لە رۆژی ١٧ی ئـۆکتۆبـەرەوە دەستی پێ کرد تا ئابلۆوقەدان کۆتایی هات ٦٠٠٠ سەربـازی فەرەنسـی لەناوچوو ، ئەمە سەرەڕای ئەو چەکە زۆرەی کەوتە دەست ڤیتمنە ٠

٢ ـ جەنەڕاڵ جیاب بەردەوام سوپاکەی زۆرو بەهێز دەکردتـا ژمـارەی گەیشتە ٨١ تیپی چـــــەکدار ٠ لە رۆژی ١٣ی کانوونی دووەمی سـالی ١٩٥١ دەستی کـــرد بە پەلاماردانـی شاری هانۆی ٠لەوکاتەدا سەرۆکـی گشتی هێزی فـەرەنسی لـــە هیندی‌چینی جەنەڕاڵ (دی‌لاتر تاسینی) بوو کە بیری لە بەرهەڵستـی کردنی سوپای ڤیتمنە کردەوەو بۆ ئەم مەبەستە پیلانێکی سەربازی دانا ٠لە ڕۆژی دوای هێرشەکە شەڕێکی توند لە دووری ٣٠میل لە باکـووری رۆژئاوای هانۆ ی روویدا کە فەرەنسی یەکان هەموو جـۆرە هۆیەکـی نامرۆڤانەو چەکی بەهێزو ناپالمیان تیا بەکارهێنا ٠شەڕ کۆتایی هـات بە کوژرانو بریندار بوونی نزیکەی ٦ هەزار سەربازی سوپای ڤیتمنـە ،وە بەدیل گرتنی پێنج سەدی تـــر ٠

٣ ـ جەنەڕاڵ دی‌لانز هەڵسا بە هێرشێکی بەربەچدانەوەی فراوان بۆ سەر بنکەی (هواین) کە دەکـەوێتـە دووری ٣٠میـل لـە باشووری رۆژئاوای هانۆی کە هێزەکانی ڤیتمنەی تیا جێگیر بووە ٠ئامانجی دی‌لاتر لەم هێرشەدا دەست بەسەرا گرتنی بنکەکە بوو بۆ پچراندنی رێگـەی یارمەتی ناردنی ڤیتمنە بەرەو باشوور ٠لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥١ دوای شەڕێکی توند کە هەموو جۆرە هۆیەکی کوشتار دژی ڤیتنامی یەکان بەکارهێنرا توانیان دەست بەسەر بنکەکەدا بگرن ٠

٤ ـ جەنەڕاڵ جیاب بۆ رزگارکردنی بنکەی (هواین) ستراتیجیەتی لێدانی یەك لەدوای یەکی بەکارهێنا • ئەم لێدانانە فەرەنسییەکانی ناچارکرد کە لە نیوەی یەکەی ساڵی ١٩٥٢دا بنکەکە بەجێبهێڵن • بەم جۆرە ئەو ریگەیە بۆ ڤیتمنە گەڕایەوە کە بەباشوورەوەی دەبەستێ •

٥ ـ پاش مردنی جەنەڕال دی‌لاتر لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٢ جەنەڕال (سالان) کرا بە سەرۆکی سوپای فەرەنسا کە بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی لێدانی دڕندانەی گەلی ڤێتنام بۆ دەست بەسەراگرتنی لادێکان بەهێزو تۆقاندن •

٦ ـ (سالان) هەوڵی لێدانی هێزەکانی ڤیتمنەو گەمارۆدانی بنکەکانیدا ، بەڵام پاش هەموو گەمارۆدانێك هیچ هێزێکی ڤیتمنە لە ناوچە ئابڵووقەدراوەکەدا نەئەبینرا (ئەمەش تاکتیکێکی سەرکەوتووانەی شەری ڤیتمنە دەردەخات • ف•هـ•م)

قۆناغی سێهەم : ئەم قۆناغە کە دوا قۆناغی خەبات بوو بە دامەزراندنی جەندڕاڵ (ناڤاری) یەوە بەسترا لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٣ • ئەم سەرۆکە نوێیەی سوپا دەستی کرد بە زیادکردنی هێزەکانی تا لە باکووری ڤێتنام گەیشتە ١٠٠ هەزار سەرباز • لە ئەنجامی هەموو ئەو پیلانانەی کە دی‌لاترو سالان دایان نابوو سوپای فەرەنسی توانی دەست بەسەر ٥ هەزار لادێی ناوچەی تۆنکین دا بگرێت ، لە کاتێکدا سەرجەمی گشتی لادێکانی ناوچەکە ٧ هەزار لادێ بوو • شانبەشان ئەم دەست بەسەراگرتنەی فەرەنسا جۆرە شەرێکی نوێ دەستی پێکرد کە هەریەك لە فەرەنسییەکانو ڤیتمنە ستراتیجی‌یەتی تایبەتی خۆیان تیا بەکارهێنا ، ڤێتنامی‌گان لاوسیان داگیر کردو گەیشتنە دەوروبەری پایتەختی

پاشایەتی ئەمیرێکی کۆمۆنیستیان کرد بە سەرۆکی حکومەت ٠ ئـــەم حکومەتەش دەستی کرد بە داواکردن بۆ حوکم کردنی وولات ٠

لێرەدا ڤیتمنە ویستی بەشێك لە هێزی فەرەنسی یەکان بکشێتــە دواوە بۆ دووبارە دەستگرتن بەســەر لادێکانــی باکـــوور ٠ بــەلام لە لای فەرەنسی یەکانەوە دەست بەسەراگرتنی بنکەی (دیان بیان فۆ) کـــــە چەند میلێك لە سنووری لاوسەوە دوورە بە مێشکی جەنەڕاڵ ناڤاری یەوە هات ٠ فەرەنسا دوو مەبەستی هەبوو لـــەم کارەیدا :ـ

١ ـ بەکارهێنانی (١٦) وەکو بنکەیەك بۆ لێدانی ئەو ڤیتمنە یانەی کە بەرەو لاوس دەڕۆیشتن ٠

٢ ـ کۆکردنەوەی هێزەکانی ڤیتمنە بەدەوری قەلاکەداو لێدانیان لێدانێکی کوشندە ٠

بەلام ئەم پلانەی جەنەڕاڵ ناڤاری لەبەر ئەم هۆیانە سەرنەکەوت :ـ

١ ـ دووری بنکەی دیان بیان فۆ لە مەلبەندی سوپای فەرەنسی یەوە لە هانۆی کە دەگاتە دوو سەد میل ، کەئەمەش وای لێکردن متمانـــــە بکەنە سەر هێزی ئاسمانی بۆ هێنانی ئازووقە ٠

٢ ـ کەوتنی دیان بیان فۆ لە ناوچەیەکی شیوی نزمدا کە چـوار دەوری چیایە ، ئەمەش وای لێئەکات کە ئاگری تۆپەکان بەشێوەیەکـــی راستەوخۆ بیان پێکێ ٠

(١٦) واتە بەکارهێنانی قەلای دیان بیان فۆ ٠ ف٠هـ٠م

٣ – هەڵەی هەڵسەنگاندنەکانی جەنەڕاڵ ناڤاری کەوای بـــاوەڕ ئەکرد کە ڤیتمنە تۆپی قورسی نیەو ناتوانێت زیاتر لە ٢٠ هـــەزار چەکدار کۆبکاتەوە ،ئەو کاتە لێدانیان ئاسان دەبێت ٠

بەڵام ئەوەی روویدا ئەوەبوو کە ڤیتمنە بەردەوام بـوو لەســەر لێدانەکانی لە لاوسدا ٠جەنەڕاڵ جیاب بینی کە ناڤاری هەلێکی لەباری هێناوەتە کایەوە بۆ ئەوەی ڤیت منە دەستی خۆی بوەشێنێ ،لەبەر ئەوە دەستی کرد بە کۆکردنەوەی هێزەکانی لە ڤێتنامو لاوس بۆ ئابلۆوقەدانی بنکەکە ، ئەم هێزانە لە بەرزاییەکانی دەوروبەری قەڵای دیان بیـــان فو جێگیربوون ٠ڤیتمنە توانی تۆپی قورس لە چینەوە وەربگرێت ٠بنکەکە هەر لە رۆژی ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٣وە تا ئاداری ساڵــی ١٩٥٤ بە ئابلۆوقەدراوی مایەوە ،کە لەماوەیەدا جەنەڕاڵ ناڤاری هەستی بە سەرنەکەوتنی پلانەکەی کـــــرد ٠

لە کاتی ئابلۆوقەدانەکەدا ناڤاری ژمارەیەك بەرەی جەنگی کردەوە بۆ ئەوەی سوپای ڤیتمنە خەریك بکات بەم بەرانـەوە ئەوســا دەست بەسەراگرتنی قەڵاکە ئاسان دەبێت بەڵام بۆی دەرکەوت کە ڤیتمنە لــە هەموو لایەکەوە بەرگری دەکاتو سوپاکەی تەنها ئەو سوپایە نیـــە کە ئابلۆوقەی قەڵاکەی داوەو ژمارەی دەگاتە ٨٠ هەزار چەکدار ،بەڵکـو هەموو ڤێتنامییەك سەربازی ئەم سوپایەن ٠ لـە مارسی ساڵـی ١٩٥٤ جەنەڕاڵ جیاب فەرمانی هێرش بردنی راستەوخۆی دەرکرد ٠بـــەم جۆرە دوای هەفتا رۆژ شەرو پێکادان قەڵای دیان بیان فۆ کەوتە دەست ڤێتنامییەکـــان ٠

لە کاتی ئابلوقەدانەکەدا فەرەنسی یەکان پەنایان بردەبەر ووتوویژ هەر بۆ ئەم مەبەستە لە ٢٦ی نیسان کۆنفرانسی جنیف کرایەوە ،بەلام ئابلوقەدان هەر بەردەوام بوو تا ئەوەبوو لە رۆژی ٦ی ئایاری سالی ١٩٥٤ قەلای دیان بیان فۆ بە تەواوی کەوتە دەستیانو جەنەرال دی کاستری وئەفسەرە سەربازی یەکان بە دیل گیران(١٨) ۰

## فەلسەفەی خەبات

شەری یەکەمی ڤیتنامی لە نیوان دوو هیزی ناهاوتا بوو ،هیزی فەرەنسا کە دەگەیشتە ٢٥٠ هەزار چەکدار ،هیزی فرۆکەوانی خۆی لە ٥٢٨ بەتالۆن (وحدة) دەدات ،پایۆریک (اسطول) لە ٣٩٠ پارچەی دەریایی و ٢٦ تیپی تۆپچی پیکهاتووە ،جگە لەمانە ٢٣٠ هەزار لە سۆپای نشتمانیو بەکریگیراوان پشگیری یان دەکرد ،وولاتە یەکگرتووەکانیش دەوری خۆی چاك بینیو ٨٠٪ی خەرجی فەرەنسا کە دەگەیشتە ٥٠٠ ملیۆن دۆلار پیش کەشی سوپای فەرەنسی دەکرد ،ئەمە سەرەرای ئەو تەقەمەنی یەی ئەمەریکا لە سالی ١٩٥١ دەیدا بە

---

(١٧) لەبەر ئەوەی بەم شەرە سوپای فەرەنسی لە ڤیتنام دەرپەرینرا ، حکومەتی ڤیتنامی سۆشیالیست لە سالی ١٩٧٨ دا ئەم قەلایەی کرد بە شوینەواریکی سەیرانگەییو پەیکەریکی نیشانەی سەرکەوتنی لی دامەزراند ۰
لەو شوینەو گردەکانی دەوروبەری کە گەورەترین سەرکەوتنی مەزنی هیزەکانی ڤیتنامی تیا هاتەدی مۆزەخانەیەکی سەربازی تیا دامەزرینراوە ۰ ف۰هـ۰م

(١٨) لەم رۆژە میژوویی یەدا هۆشی منە ووتی
(هیچ سوپاو چەکیك ناتوانیت زال بی بەسەر گیانی قوربانیدان لەدلو دەروونی ڤیتنامی یەکان ف۰هـ۰م

فەرەنسا کە دەگەیشتە ٦ هەزار تەن لە مانگێکا ،ئەم ژمارەیە لە سـالی ١٩٥٣ بۆ ٢٥٠٠٠ تەن بەرزبۆوە ،پاشان ٨٨ هەزار تەن ٠لـە سەرووی ئەم هەموو یارمەتی‌یانەوە پردێکی ئاسمانی لە نێوان پاپۆری حەوت لـە ژاپۆن‌و فلیپین‌و لە نێوان تۆنکین کرابۆوە بۆ ناردنی یارمەتی‌و ئازووقـە بەشێوەیەکی خێرا ٠هەروەها ٢٥٠ فرۆکەوانی ئەمەریکـایی لە کـردەوە کوشتاری‌یەکاندا هاوبەشی‌یان دەکرد ٠تا ئەم هێزە گەورەیەی ئاسمـان کردن گشتی بـەرەو رووی گـەلی ڤێتنام کرابۆوە کـە خاوەنی پارەو چەکێکی زۆر کەم بوون ،کەچی لە کۆتاییدا گەل شـەڕی بـەلای خـۆیدا راکێشت ٠

بێ‌گومان دیاردەی سەرکەوتنی گەلێکی بێ‌دەرامەمەت لەسەر ئـەم هێزە بێ‌شومارە کارێکە پێویستی بەشی‌کردنەوە هەیـە ٠بەلام هیـچ شی‌کردنەوەیەك لە ئارادا نیە تەنها ئەوە نەبێت کە ئەم گەلە قارەمانە شەڕێکی مەردانەیان کرد کە لەسەر فەلسەفەیەکی تایبەت بنیان نرابـوو (فەلسەفەی خەبات کردن تا سەرکەوتن )٠ ئەم فەلسەفەیە لە مێشکی سێ مرۆڤی ژیرەوە هەلقوولاوە :هۆشی‌منە ئامانجەکانی خەباتی دیاری کـردو هیوا کانی ژیاندەوە ٠

ـترۆنگ شن : بناغەو هەنگاوەکانی خەباتی دارشت ٠

ـجەنەڕال فۆنجوین جیاب :ـ بە چەمکی (مفهوم) رێکخستنی دیاری کراو سوپای رێکخستو تا سەرکەوتن سەرۆکایەتی کـرد ٠

هۆشی‌منە توانی لە کۆبوونەوەکانی سالی ١٩٣٩دا بە هاوبەشـی کۆمیتەی ناوەندی پارت ئامانجەکانی گەل دیاری بکات کە بریتی‌یـە

له رزگاربوون له دەسەڵاتی بێگانە کە دەرەبەگەکان دەیپارێزێ ،هەروەها رال بوون بەسەر ئەو چەوساندنەوەیەی کە لە بەرژەوەندی سەرمایەداری فەرەنسی‌و ژاپۆنی‌یە رزگاربوون لە دەسەڵاتی بێگانە بە هەنگاوی یەکەم دادەنرێ کە هەنگاوەکانی تری بەدوادا دێت وەك چاککردنی کنستوکاڵ‌و دابەش‌کردنی زەوی‌وزارو پێگەیاندنی پیشەسازی ،هەروەها بە کارهێنانی سامانی کانەکان بۆ قازانجی گەل‌و لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و تەندروستی گەلی ڤیێتنام لە رێگەی هەڵمەتەکانی پێ‌ناساندن‌و هوشیارکردنەوەدا کە کادران‌و لاوانی پارت لە هەزاران گوندی ڤیێتنام پێی هەڵسان لەم ئامانجانە گەیشتن گەل نیشکی هاتنەدی ئەم ئامانجانەیان دەبینی کە هەزاران ساڵە بە درێژایی سەردەمی دەرەبەگایەتی‌و دەسەڵاتی بێگانە بۆی تێ‌دەکۆشن ٠

بەڵام ترۆنگ شن کە ناوی (دانگ ئکسوان کۆ)ی لە خۆی نابوو کتێبێکی بە ناوی (خەبات سەردەکەوێت) لە ساڵی ١٩٤٧ بە زمانی ڤیێتنامی دانا کە خەبات‌و هێڵەکانی خەباتی تیا دیاری کردووە :ــ

١ ــ ئامانجی خەباتی گەلی ڤیێتنام جێ‌بەجێ‌کردنی شادی‌و ئازادی‌و رزگاری‌و دیموکراتی‌و ئاشتی‌یە لە رێگەی دروست کردنی ڤیێتنامێکی نوێی بەکگرتوو ٠

٢ ــ ستراتیجیەتی ئەم خەباتە خەباتی درێژخایەنە چونکە بەرەنگاری هێزێکی گەورەتر لە خۆی لە رووی تەکنەلۆجی‌یەوە بووە ،وە پێویستە سوود لە کات وەربگیرێ بۆ لێدانی ئەم هێزە لێدانێکی بەش‌بەش لە هەر دەرفەتێکی گونجاودا ،وە چاوەڕوان کردنی گۆڕانی رای گشتی فەرەنسی‌و جیهانی بۆ دژ وەستانی کوشتار ،کە خۆڕاگرتنی درێژخایەن بناغەی ئەم گۆڕانەیە ٠

خەباتی تەواو (نضال متكامل الاجزاء) متمانە دەگـــانە ســـەر گیانی تێكۆشەری تاك كە لە سوپای تێكۆشەراندا كۆدەبێتەوەو هێزێكیان دەداتێ ،وە پاڵیان دەنێت بۆ سەركەوتن . ئەم گیانەش باوەر كردنە بـــە ئامانجەكانو رازیبوونە بە كاركردن . ئەو كاتە مەشقی بەردەوامی گیانیو مەعنەوی دەبێتە بناغەی دروست كردنی تێكۆشەران .

٤ ـ بەهێزكردنی خەبات پێویستی بەكاری سیاسی ناوخۆ هەیـە بو بەجێگەیاندنی یەكێتی گەل ،بەلام مەبەست لـــە خەبات لـە دەرەوە بۆ پەكخستنی دوژمنو بێهێزكردنی مەركەزی سیاسیەتی .

٥ ـ دانانی سیستەمێكی (نظام) ئابووری بەستـــراو بە خـەباتەوە ،وەتەرخان كردنی هەموو چالاكیەكی بۆ خزمەتی شۆرش شانبەشانـی پاراستنی پێویستیەكان بێئەوەی زیاد لە پێویست سەرف بكرێ .

٦ ـرۆشنبیریو زانستی لەسەر پلانی نەتەوەیی زانستی میللی برەوا بەرێوە . ترۆنگ شن خەباتی بۆ سێ قۆناغ دابەش كـــرد :ـ

یەكەم قۆناغی بەرگری ـ: لەم قۆناغەدا دوژمن ستراتیجیەتـــی پەلاماردان بەكاردەهێنێ بۆ داگیركردنی بنكەكان ،لەبەر ئەوە ئەركـــی تێكۆشەران لێرەدا پەلەكردنە بۆ دەست بەسەراگرتنی بنكەكان دەست بەسەراگرتنێكی سیاسیو سەربازی ،وە دەبێت واز لـــە دوژمن بهێنــرێ با هەر خەریكی چاككردنو دروستكردنی رێگەوبان بێت بۆ مەبەستـی هێرش بردنو فراوان كردنی مەیدانی شەر .

## دووەم : قۆناغی هاوسەنگی هێزەکـــان

لێرەدا هێزەکان هاوسەنگ دەبن ،لەم کاتەدا دوژمن پەنا دەباتــە بەر بەرگری کردن لە ئەنجامی پەلامارە لەناکاوەکانی شۆڕشگێران ٠لــەم قۆناغەدا هێزەکانی خەبات ئەو توانایەی نیە کە بەردەوام بێ لسەبــنەی ڕۆیشتن بۆ پێشەوە ،وە پێویستە هەمیشە ئامادەی گەڕانەوە بن بـــۆ شوێنە بنەرەتی یەکانیان ،هەروەها دەبێت هێرش کردن لەم قۆناغــــەدا بچووك بێت چونکە هەمان کاریگەری هێرشێکی گەورەی هەیە ٠لە هەمان کاتدا دەبێت شۆڕشگێران هەوڵی گرتنی بنکە گرنگەکانی بدەن ،یـــا مەرکەزی ئەو شوێنە بەهێز بکەن کە بە دەستیانەوەیە ٠

بە شێوەیەکی گشتی ئەم قۆناغە بە قۆناغــی گۆڕانی تــەرازووی هێزەکانو ڕزگاربوون لە هەندێ کۆسپ دادەنرێت بۆ ڕێگە خۆش کردن بۆ هێرشی بەرپەچدانەوە ٠

سێهەم :قۆناغی هێرشی بەرپەچدانەوەو بەربلاو (مرحلة الهجــوم المضاد والشامل) لێرەدا تەرازووی هێرشی بەرپەچدانەوەی گشـاتـــــی ئاوەژوو دەبێتەوە کە تیایدا دەست بە هێرشی بەرپەچدانەوەی گشتـــــی دەکرێت ٠لەم قۆناغەدا هێزی سوپای میللی زیاد دەکـاتو سوپـــــای دوژمنیش تووشی شکستی دەبێت ئەویش لە ئەنجامــی نزم بوونــەوەی گیانی مەعنەوی لە ناو پیاوەکانیدا ٠گرنگترین خاسیەتی تەکتیکی کـــــە پێویستە هێزەکانی گەل ڕەچاوی بکەن توانای ئەم هێزانەیە بـــــۆ کۆبوونەوەی بە پەلەو هەڵسان بە هێرشی لە ناکاو پێش ئەوەی هەڵسن بە هێرشی ڕێكوپێك ٠تزۆنگ شن ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەم سێ قۆناغــە پەرەسەندنی گشتی پلانی خەبات دەردەخات ،وە دەتوانرێ بــە پـــێی

باروودۆخو ئەنجامو تاقیکردنەوەکان لەوانەیە درێژخایەن بێ یا ماوەیەکی کورت تیا بمێنێتەوە ٠ئەم پلانە بە تەواوی بەسەر هەر سێ قۆناغەکەی شەڕی هیندیچینی تا ئەو کاتەی قەلاّی دیان بیان فۆ گیرا جێبەجێ بوو ٠وە ئەو دەسکاریی‌یەی لەم پلانە کرا دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی هێزی دوژمنو بەردەوام بوونی دەستگیرۆکردنی بە سەربازو چەکو ئازووقە لەلایەن هێزە گەورەکانی وەك ئەمەریکاوە ٠

بەلاّم جەنەراڵ جیاب بایەخی بە کاری سیاسی لە شەڕدادا ،وە پێویستی ئاراستەکردنی شەری ئاراستە کردنێکی سیاسیو سەربازی پێکەوە دووپات کردەوە چونکە کاتێك ئاستی سەربازی دوژمن بەرز دەبێت گەل ناچار دەبێت بە دوای هۆیەکی بەرزبوونەوەدا بگەرێت کە ئەویش هۆی سیاسیو مەعنەوی‌یە ٠جیاب ئەم سێ قۆناغەی بەست بە قۆناغێکی گرنگی پێش دەست پێکردنی خەبات کە لە کاتی خەباتیشدا هەر بەردەوام دەبێت ،ئەویش قۆناغی خۆئامادەکردنی تەواوی ماددیو مەعنەوی‌یە ٠

ئەوەی لەسەر گەل پێویستە ئەمانەن :ــ

١ ــ بنیاتنانی بنەمایەکی رەوشت بەرزی کە تیایدا تێروانینی گەلو تێروانینی تاك یەك بگرێتەوە ٠٠

٢ ــ پەرەپێدانی بەرووبوومی ماددی بە بەر هەم هێنانو سۆگەرکردنی یارمەتی وولاّتە دۆستەکان ٠

٣ ــ هێنانەکایەوەی بارێکی دەولەتی گونجاو بۆ شەڕ کە تیایدا بتوانرێ راو سۆزی گەلانی دۆست رابکێشرێ ٠

٤ ـ بەهێزکردنی گیـــانی مەعنەوی سوپای گـــەل‌و بنیاتنانـــی باوەرکردن بە سەرکەوتن لە دڵ‌و دەروونی گەلدا ٠

سەرەڕای ئەوەی جیاب ئەم بناغە پێویستی‌یانەی سەرکەوتنی دانا، بەڵام لە ساڵی ١٩٥١ هەڵەی کرد لە لێدانی دوژمن پێش ئەوەی هـــەموو لایەنەکانی قۆناغی خۆئامادەکردنی ماددی‌و مەعنەوی تەواو بووبێ ، لەبەر ئەوە گەڕایەوەو لە ساڵی ١٩٥٣ دووبارە خۆی ئامادەکردەوە بۆ لێـــدانی دوژمن ٠

سەرەتاکانی (مبادیء) جـەنەڕاڵ جیـــاب تەنها بەدیاری کردنـــی قۆناغەکانی خەباتەوە دیاری‌کردنێکی ستراتیجی نەوەستا بوو ، بەڵکـــو بایەخی بە ڕێکخستن‌دا کە بەردەوامی خـــەبات تا ڕاکێشانی جەنگـــەکە مسۆگەر دەکات ٠

پێش ساڵی ١٩٥٠ تەنها سوپای نیزامی هەبوو کە لە سەربازگەکان مەشقیان دەکرد ، بەڵام لەو ساڵـــەوە هێزەکانی خەبات بۆ سێ بەشـــ دابـــەش کرا :

١ ـ نیزامی‌یەکان : تەنها بۆ شەڕکردن تەرخان کرابوون‌و لـــە سەربازگەکاندا دەژیان ٠

٢ ـ ناوخۆیی‌یەکان : دوای ئەوەی لـە سەربازگەکـــان مەشقیان پێدەکرا کاری شەڕیان پێدەسپاردن ٠ لەپاڵ بەرگری‌کردن‌و هێرش بردن مەشقیان بە هێزە میللی‌یەکانیشن دەکـــرد ٠ ئەمانـــە لـــە هەرێمـــە جۆربەجۆرەکاندا دەژیان ٠

٣ ـ هێزی میللی : بەهموو لادێکان پڕبوون لە تێکۆشەران کە بە ڕۆژ لە کێڵگەکان ئیشیان دەکردو بە شەو چەکیان هەڵدەگرت بۆ هێرش بردنە سەر دوژمن ٠

لە ئەنجامی ئەم ڕێخستنە نوێیەدا دەڵتای سووری ناوچەی تۆنکین کە فەرەنسی یەکان تیایدا نیشتەجێ ببوون بووە ناوچەیەکی خەبات ، وە دەست بەسەرا گرتنی فەرەنسی یەکان لە ناوچەگە زۆر رووکەش بوو ٠

بەم جۆرە خەباتی گـــەلی ڤێتنـــام پشتی دابووە فەلسەفەیەکـی تایبەتی یەوە کە بریتی بوو لـــە بەستنی خەباتی سیاسی بـــە خەباتـی عەسکەری یەوە ، بۆ ئەوەی گەل توانایەکی مەعنەوی بەرز پەیدا بکات و هاوسەنگ بێت لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆجی یەی دوژمن ٠ سەرەڕای ئەمەش خەبات لەسەر پلانێکی قۆناغی دانرابوو کـــە بەرەو سەرکەوتنی تەواو دەچێت ، هەروەها خۆراگرتن و ڕازی بوون بە خەباتی درێژخایـەن تا سەرکەوتن ٠ /

ئەو ڕێکخستنانەی جیاب خستیە خەباتەوە کارێکی گەورەی کـــردە سەر یەکێتی گەل و سوپا کە بە جێبەجێ کردنێکی ووتەکانی ترۆنگ شن دەژمێردرێ کە دەڵێت خەبات متمانە دەکاتە سەر یەکێتی چونکە پەیوەندی گەل و سوپا وەك ماسی و ئاو وایە ٠

ئەگەر ئەمە فەلسەفەی خەباتیان نەبوایە کـە لەسەر یەکێتی نێوان گەل و سوپا ، سیاسەت و خەبات بنیات نرابوو ئەم سەرکـــەوتنە بـەدی نەنەهێنرا کە بە ڕاونان و دەرکردنی ئیمپریالیزمی فەرەنسی لە خاکـــی ڤێتنام کۆتایی هات ٠

# کۆنفرانسی جنێڤو ئەنجامەکانی

**بەستنی کۆنفرانسەکـــە :**

ڕای گشتی جیهان شەڕی فەرەنسی یەکانیان لە ڤێتنام بە شەڕێکی چەپەڵ دەزانی، تەنانەت گەلی فەرەنسی بەم دوژمنکاری یە ڕازی نەبوون• بەم جۆرە بارودۆخ لەباربوو بۆ هەڵسان بە جێبەجێکردنـــی ئاشـــتی لـــە ڕۆژهەڵاتی دووردا • لە کۆڕێکی چوار دەوڵەتە گەورەکان « ئینگلتەرە ، فەرەنسا ، ئەمەریکا ، یەکێتی سۆڤیەت»لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٤ بڕیاردرا کە کۆبوونەوەیەکی تر ببەسترێ بۆ لێکۆڵینەوە لە گیروگرفتی کۆریاو ڤێتنام کـــە ئەو چواردە دەوڵەتـــە بەشداری تیا ئەکـــەن کـــە بەرژەوەندی هاوبەشیان لە هەر دوو گیروگرفتەکەدا هەیە • لە ئەنجامدا بڕیار درا کە ئەم کۆبوونەوەیە لە ٨ی ئایار لە شاری جنێڤ ببەسترێ• بە ڕێکەوت ئەم ڕۆژە بوو بە ڕۆژی دوای ڕووخاندنی قەڵای دیان بیان فۆ بە دەستی هێزەکانی ڤیتمنە • پاڵەپەستۆی گەلی فەرەنسی گەیشتە ڕادەیەك وای لە وەزارەت کرد کە واز بهێنێ‌و وەزارەتێکی نوێ بە سەرۆکایەتـــی ( ماندیس فرانس ) دابمەزرێنرێ • حکوومەتی نوێی فەرەنسا بە هەموو پەرۆشێکەوە بۆ ئاشتی لە ناوچەکـــە چـــووە کۆنفرانسی جنێڤەوە دوای ئەوەی تووشی زیانێکی ماددی‌و مەعنەوی زۆر بوو بە دەستی سوپای گەلی ڤێتنام سەرەرای ئابڕوو چوونی •

لەم کۆنفرانسە ئەم دەوڵەتانە بەشداری‌یان تیا کرد بەریتـــــانیا ،یەکێتی سۆڤیەت ، چینی‌میللی ،شانشینی لاووس ،شانشینی کەمبۆدیـــا ،کۆماری ڤێتنامی دیموکرات (ئەو حکومەتەی هۆشی‌منە سەرۆکایەتـــی دەکرد) ،حکومەتی دوەلەتی ڤێتنام (ئەو حکومەتەی باودای لە سایگـــۆن

سەرۆکایەتی دەکرد) ،هەروەها وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بەشداری کرد لە دواییدا هەلویستێکی تایبەتی وەرگرت ٠

کۆنفرانسی جنێف بەنیسبەت ڤێتنام بە ڕێکەوتنی هودنەو ئاشکرا کردنی دوا بڕیاری جنێف کۆتایی هات ٠

## ڕێکەوتنی هودنەو دوا بڕیار

یەکەم ڕێکەوتن لە ٣٠ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٤ مۆرکرا کە لایەنی فەرەنسی جەنەڕاڵ (دلتیل) ،وە لایەنی ڤێتنامی (تاکوانگ) بەشداری ڕێکەوتنەکەیان کرد٠حکومەتی ڤێتنام نارەزایی دەربڕی دژی ڕێکەوتنی هودنە چونکە فەرەنسا بە تەنها مۆری ڕێکەوتنەکەی کردبوو ،بەلام هیچ بایەخێك بە نارەزایی دەربڕینەکەی ڤێتنام نەدرا ٠

بەپێی ماددەی یەکەمی ڕێکەوتنی هودنە پێویستە هەریەك لە هێزەکانی فەرەنسیو ڤیتمنە لە هێلی ١٧ی باکوور بکشێنەوە ،بە جۆرێك کە هێزەکانی فەرەنسا بۆ باشووری ئەم هێلە بکشێنەوە ،وە هێزەکانی ڤێتمنە بۆباکووری هێلەکە ٠حوکمو بەڕێوەبردن لە هەر بەشێك لەم بەشانە کە هێلی ١٧ی باکوور لێکیان جیا ئەکاتەوە بەدەست ئەو لایەنەوە دەبێت کە بە پێی ڕێکەوتنامەکە دەستی بەسەرا دەگرێت ٠وە بە گوێرەی ماددەی چواردەش دەبێت هەریەکەیان واز لە کاری دژواری یا ملهوری ئەو کەسو دەستانە بێنن کە لە پێش ڕێکەوتندا لەگەل لایەنی بەرامبەر هاوکارییان کردووە ،وە هەریەکەیان دەبێت یارمەتی لایەنەکەی تر بدات لە کۆچکردنی ئەو کەسانەی ئارەزووی کۆچکردنیان هەیە بۆ ناوچەی لایەنەکەی تر ٠ هەروەها بە پێی ماددەی

پانزه دەبێ هەریەکەیان ڕێ لە کـردەوەی لانو تێـکدانو ئازاردانـــی شارنشینەکان بگرن ،دەبێ ماڵ وگیانیان لە مەترسی بپارێزرێ ،جگـــە لەمانە نابێت دەستکاری رژێمەکانی بەڕێوەبردنی ناوخۆ بکرێ ٠

بەڵام هەردوو ماددەی ١٧ ، ١٨ قەدەغەی ئەوە دەکات کە نابێت هیچ جۆرە چەکدو سەربازێك ڕوو لە بەشی باکوورو باشوور بکەن ،وە نابــێ هیچ جۆرە بنکەیەکی سەربازی نوێ لەم دوو بەشەدا دابنرێ ٠

ماددەی نۆزدەش ڕێگا نادا کە هیچ دەوڵەتێکی بێگانــە بنکـــــەی سەربازیو سیاسەتی دوژمنکاری بەکاربهێنێ ٠

ماددەی ٢٩ و ٣٤ یش لە کاری کشانـەوەی هێزەکان لە ژێـــر سەرپەرشتی دەوڵەتان دەدوێ کە دەبێ نوێنەرانی هیندو پۆڵەندەو کەنەدا لە دەستەی سەرپەرشتیکەردا بەشداری بکەن ٠

دوا بڕیار (الاعلان النهائي)کە لە ڕۆژی ٢١ی تەمموزی ساڵی ١٩٥٤ دەرکرا دەستی بۆ ڕێکەوتنی هودنەی نێوان کۆماری ڤێتنامو فەرەنســا ڕاکێشت کە قەدەغەی ناردنی هەموو جۆرە چەکێکی سەربازیو شــەڕی بۆ ڤێتنام دەکرد ،هەروەها قەدەغەی چوونی هەر بەشێك لەو دوو بەشــە بۆ ناو پەیمانە سەربازییەکان کرد ،وە بڕیاری دوورکـەوتنەوە لـــــە سیاسەتی دوژمنایەتیدا کۆنفرانسەکە دانی بەوەدانا کە ئەمە ڕێکەوتنێکی سەربازییە ،وە هێڵی دابەش کردنە ١٧ی باکوور هێڵی هودنەیە نـەك سنوورێکی سیاسی نێوان دوو دەوڵەت ،بەڵکـــــو یەکێتیو ئازادیو رزگاریو سەربەخۆیی دوا ئامانجە کە ئەو هەڵبژاردنە دەیهێنێتەدی کـە لە تەمموزی ساڵی ١٩٥٦ لە ژێـر چاودێـری لیژنەیەکـی دەوڵەتـــــی جێبەجێدەکــــــرێ ٠

دەوڵەتانی بەشدار پەیمانیاندا کە بە چاوی ڕێزەوە وەکــــــو دەوڵەتێکی تەواو سەیری یەکێتی ڤێتنام بکرێت • هەروەها رایان گەیاند کە پێویستە قەدەغەی دەستخستنە کاروباری ناوخۆی ڤێتنام بکـــــرێ ،وەلە رێگەی لیژنەیەکی دەوڵەتی‌یەوە گفتوگۆ بکرێ دەربارەی هەرچی‌یەك پەیوەندی بە ڤێتنامەوە هەیە بۆ کارکردن بە بەندەکانی رێکەوتنەکە •

گرنگترین شت کە لە دوا بڕیاردا هاتبوو ئامادەیی فەرەنســــا بوو بۆ کشانەوە لە زەوی‌یەکانی ڤێتنام و لاوس و کەمبۆدیا لە هەر کاتێکدا کە حکوومەتەکانی ئەم دەوڵەتانە داوا بکەن ،وەپەیمانـــی‌دا کە رێـــزی سەربەخۆیی و یەکێتی ئەم زەوی‌وزارانە بگرێت •

هەموو دەوڵەتانی بەشدار مۆری بەیمانەکەیان نەکرد ،بەڵام هەشت دەوڵەت لە کۆتایی کۆنگرەکە بەم رێکەوتنە رازی بوون کۆماری ڤێتنامی سەربەخۆش رەخنەی لەم بڕیارە گرت و دژی هودنەی کاتی و مۆرکردنـــی رێکەوتنەکە وەستا چونکە رای حکومەتی ڤێتنام یان نوێنەرەکەی لـــــە کۆنگرەکەدا وەرنەگیرا ،وە بڕیاریدا کە رێگە نەدا هیچ جۆرە کارێ بکرێ کە پەیوەندی بەم رێکەوتن نامەوە هەبێت ،وەخۆی لێپرسراوە لە ماڤــــــە پیرۆزەکانی گەل و یەکێتی زەوی‌یەکانـــــی •

بەڵام وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشداری دەرکردنی بڕیارەکەی نەکردو رەخنەی لە هەریەك لە رێکەوتن‌نامەکەو دوا بڕیار گرت جگــــــە لە ماددەی ١٣ی رێکەوتننامەکە نەبێت کــــە قەدەغــەی کـاری دژوار هەرەشە کردن دەکات ،ئەوەیشی ئاشکرا کرد کە هەر کارێك دژی ئــــەم ماددەیە بکرێت بە کارێکی دوژمنانەی دەداتە قەڵەم و مانای هەرەشە کردنە لە ئاشتی جیهـــــان •

وە دەبێ هەڵبژاردنیش لە ژێر چاودێری دەوڵەتان بکرێت •

ئەوەی جێگەی تێبینییە لەم ڕێکەوتنەدا ئەوەیە کە ناوەڕۆکەکانی هیــچ گەلێنێکیان بۆ دانانان بە دەسەلاتی تەواوی هەریەك لە دوو حکومەتــی

ڤێتنام بەجێنەهێشت ·وە ئەو حکومەتەی کە باروودۆخی تیادا جێگیــــر دەبێ ئەو حکومەتەیە کە بە پێی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٦ دروست دەبێ ، ئەم دابەشکردنەش دابەشکردنێکی کاتییەو هەندێ زرووفی سەربــازی ناچاری کردن کە پەنا بۆ ئەم کارە ببەن ·

بەم جۆرە هەر لە ڕۆژی ٢١ تەمموزی ساڵی ١٩٥٦ باری ڤێتنـــــام لە دوو شێوەدا دەرکەوت : ــ

یەکەم: دەکەوێتە باکووری هێڵی پانی ١٧ی باکوور کە بریتییە لـــــە ڤێتنامی باکوور (ڤێتنامی دیموکراتی میللی)و ڕووبەرەکەی دەگاتــە ١٦٤ هەزار کم٢ ،وە ژمارەی دانیشتوانیشی دەگاتە ١٤ ملیۆن سەر ·

ئەم بەشە لە بەرزاییەکانی باکوور پێکهاتووە کە لە گەڵ چیـــن و لاوس هاوسنوورە ،وە بە (ڤیتباك)و (تایباك)و دەشتی تۆنکین ناسراوە· لەم بەشەی باکوور حکومەتێکی سۆشیالیستی دیموکراتی دامەزرا کـــــە ڕووی لە بنیات نانی ژیانو ڕۆیشتن لەســەر ڕێگــەی گۆڕانکــــاری سۆشیالیستی بـــوو ·

دووەم دەکەوێتە باشووری هێڵی پانی ١٧ی باکوور کە بریتییـــە لە ڤێتنامی باشووریو ڕووبەری ١٧٠٢٣٠ کـم٢ یە ،وە دانیشتوانیشـی خۆی لە ١٦ ملیۆن سەر دەدات ·

لەم بەشەدا ئەو سەرۆکانە حوکمیان گێرا کە کلکی رۆژئاوان ، ئــەم حکوومەتە لە سەرەتاوە بە باودای دەستی پێ کرد ، ئنجا بە دامەزراندنــی حکوومەتی بەکرێ گیراوی ئەمریکا (نجودن دیم) ، پاشان گەلێ کودەتـــای سەربازی یەك لەدوای یەك روویدا کە هەمووی لە بەرژەوەندی ئەمریکــای خوێن خــــۆر بوو(١٩) ٠

(١٩) لەمانگی تەمموزی ساڵی ١٩٥٤ هۆشی منە پێش گەڕانەوەی بــــۆ هانۆی ووتی (ئاشتی مانای ئاشتی هەتا هەتا ناگەیەنێت) ٠
ئەویشی بۆ گەل روون کردەوە کە) خەبات لە پێناوی پتەوکردنـــــی ئاشتی و گێرانەوەی یەکێتی هەردوو بەشەکەی وولاتِ ، وەبەجــێ گەیاندنی سەرکەوتنی تەواوو دیموکراتی خەباتێکــی قورســـــو درێژخایەنـــــــە) ٠
دەبێ باکوور بکرێ بە بناغەو رەگی هێزە شەڕکەرەکانهانی تێدابێ ، ناتوانرێ ماڵێك پتەو بکرێ ئەگەر بناغەکەی بەهێز نەبێت دارو درەخت گەورەنابێ و گەشە ناکات ئەگەر بێتوو رەگەکانی بەهێـــز نەبێ ، دەبێ بەهەموو هێزێکمانەوە کۆشش بکەین بۆ بەهێزکردنی باکوور کە هێزو پێشکەوتنی بداتێ ) ٠

## ژیان لە ڤێتنامی دیموکراتی میللی «ڤێتنامی باکوور»

**بنیـــاتی ڕامیـــاری :**

لە گرنگترین ئەنجامەکانی کـۆنفرانسی جنێڤ جێگیربوونـــی حکوومەتی ڤیتمنە بوو لە باکوور ٠ بە مۆرکردنی ڕێکەوتن‌نامەی هودنـــە بە شێوەیەکی ڕەسمی دان بە کۆماری ڤێتنامی دیموکراتی نرا کە خاوەنی ١٦٤ هەزار کم٢یەو ٥ر١٤ ملیۆن مرۆڤی تیا دەژێ (بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٦٢ ) ٠

لە ساڵی ١٩٤٦ ڤیتمنە توانی لە دروستکردنی حکومەتێکـــی سەربەخۆ سەربکەوێ ٠ هەر لەوکاتەوە دەستی کرد بە پـەرەسەنـدن ،نەوەبوو لە ساڵی ١٩٥٤ خوێنەرێکـی ڤێتنامـی بەشداری کۆنفرانسـی جنێڤی کـردو ڕێکەوتن‌نامەی هودنەی مۆرکـــرد ٠ ئیتر لەوســاتـەوە بەشێوەیەکی ڕەسمی دان بە ڤێتنامدا نـــرا ٠

بەندی یەکەمی دەستووری ڤیتمنە کە لە ٣١ی کانوونی یەکـــەمی ساڵی ١٩٥٩ دەرچوو بە ئاشکرا ڕای گەیاند کە هەردوو ڤێتنـــــام یەك بەشەو لێك جیانابێتەوە ٠بە پێی ئەم دەستوورە پەرلەمانی یەکەم هەڵبژێردرا ٠وە لە ١٥ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٠ پەرلەمان هەڵســــا بە هەڵبژاردنی هۆشی منە بەسەرەك وەزیرانی ڤێتنـــام ٠

لە کۆنفرانسی سێهەمی پارتی سۆشیالیستی ڤێتنامی بڕیـــاری پلانی پێنج ساڵە دەرکرا (١٩٦١ ـ ١٩٦٥) ٠بە گوێرەی ئەم پلانـــــە دەستکرا بە بنیات‌نانی پرۆژەکانی پەرەپێدان لە بواری پیشەســـازیو کشتوکاڵیو ڕۆشنبیری بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی دانیشتوان ٠

لە پێشەکی پلانەکەدا هاتووە کە (مەبەستی سەرەکی لە پێنـــــج ڕەگەزی پلانەکە بریتی‌یە لە بەهێزکردنی ڤێتنامی دیموکراتی‌و کارکردن‌و حەبات کردنە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجێکی نشتمانی مەزن کە ئەویش یەکگرتنی هەردوو بەشی وولاتە) •

بۆ پتەوکردنی ڕژێمی سـۆشیالیستی‌و زاڵبوون بەسەر پاشماوەی چەرخە ئیمپریالیستی‌یەکان پێویستی بە زاڵبوونە بەسەر کـۆنەپەرستان‌و دەرەبەگ‌و سەرمایەدارو بیروقراتی‌یەکان ،بۆ ئەم مەبەستە ڕژێمێکـــی تایبەتی دانرا کە پێیان دەووت (فات دۆنگ) کە بەو پێیە ژمارەیـەك کادر پێکەیەنرا بۆ کارکردن لە لادێکان بۆ هوشیارکردنەوەی جوتیاران‌و ئاشکرا کردنی خراپەکاری خاوەن ملکەکانی پێشوو ،وە دەبێت گشت دەرەبەگ‌و سەرمایەدارەکان بهێنرێنە بەردەم دادگای گەل بۆ موحاکەمـە کردنیان بە پێی ئەو تاوانانەی بە سەریاندا دادەسەپێت •

ئەوانەی لایەنی شۆڕشیان نەئەگرت لە سوپاو کاروباری میـــری دەرکران ،هەروەها ئەنجوومەنە میللی‌یەکان (المجالس الشعبية) دامەزراو نەو کارانەی گرتە خۆی کە لە چەرخی ئیمپریالیستی‌دا بیروقراتی‌یەکان گرتبوویانە خۆیان ،جگە لەمانە هێزی میللی هاتەکایەوە کە لـــــــە جوتیاران پێکهاتبوو بۆ بەرگری ناوخۆیی •

کادرەکانیش دەوری خۆیان باش بینی لە هوشیارکردنەوەی میللـی ،وە هەر تاکێکی کۆمەڵ بوو بە ئەندام لە ڕێکخراوێـك لە ڕێکخـــــــراوە ئاسۆیی‌یەکانی پارت (المنظمات الافقية للحزب) وەك ڕێکخراوی ئافرەتان‌و کشتوکاڵی‌و کرێکاران‌و قوتابیان •••هتد •ئەم ڕێکخراوانە بیروباوەری شورشیان بلاودەکردەوە تا لە کۆتایی‌دا دژ شۆڕشەکان بە تـــــەواوی لەناوبران‌و گەل لە یەك ئاستدا یەکی گرت ،ئەویش ئاستی گـــــوڕان بەرەو سۆشیالیستی بوو •

## ژیانی ئابـــووری

ماوەی نێوان سالی ١٩٤٥ ـ ١٩٥٤ بەوە جیادەکرێتەوە کـــە شەڕی رزگاری یەکەمی تیا کراو هەموو چـالاکی‌یەکی ئابووری بـــۆ خزمەتی شەڕ بەکارهێنرا ، وە چالاکی ئابووری‌یان بە تەواوکەری شەڕ ئەژمـــارد ٠

سەرەڕای ئەو شەڕە ئازەوایەی بەسەر گەلدا سەپێنرا بـــوو زیادی‌یەکی تەواو لە بەرهەمهێناندا بەدی‌ئەکرا ،بـۆ نموونە لـــە بەرهەمهێنانی کشتوکالی‌دا رووبەری زەوی‌یە کێلراوەکان لە ١٨ هەزار هکتارەوە لە سالی ١٩٤٤ .بۆ ٣٥٧٠٠ هکتار لە سالی ١٩٥٢ بەرزبـۆوە بێ‌گومان ئەم بەرزبوونەوە گەورەیـەی بەرهەم هێنان لـە بنەرەتـــدا دەگەرێتەوە بۆ چالاکی‌یەکانی گەل. کە بۆ خزمەتی شەڕ تەرخـــان کرابوو ،ئەویش بەهۆی ئەو باوەرە بەتینەی بە شەڕی چارەنووسیـان هەبوو کە پال بە هەر تاکێك لە تاکەکانی گـەلەوە دەنێت بـــۆ بەشداری کردن لە شەڕی چارەنووس ٠

حکومەتی ڤێتنامی دیموکراتی دەستی کرد بە بنیاتنانی ژیانـی ئابووری گەلی ڤێتنامی باکوور لەسەر بناغەی سۆشیالیستی کـــە ئامانجی زال‌بوونە بەسەر پاشماوەی سەرمایەداری‌و دەرەبەگایەتـی ،وە جێگرتنەوەی بەرهەم هێنان و دابەش‌کردنی سۆشیالیستی (الانتـــاج والتوزیع الاشتراكي)جێگەی رژێمی سەرمایەداری کە تیایدا دەبێ پشت بە توانای گەل‌و کۆمەکی وولاتە سۆشیالیستەکان ببەستریٚ ٠

بنیات نانی ژیانی ئابووری بە سێ قۆناغی سەرەکی تێپەری کـــە لە سالی ١٩٥٥ ـ ١٩٦٥ی خایاند :ـ

یەکەم : قۆناغی دووبارەدروست کردنەوەی ژیان (مرحلة اعـادة الحیـاة) (١٩٥٥ ـ ١٩٥٧) ٠لەم قۆناغەدا یاسای چاککردنی کشتوکالی جێبەجێ کرا ،ئەویش بەهێنانە کـایەوەی ( هەرەوەزی کشتوکالـی سۆشیالیستی)کە لە کۆتایی ئەم قۆناغەدا ٤٠٪ی کشتیارەکانی گرتـە خۆی ٠لە سالی ١٩٥٧ لەژێر سێبەری هەرەوەزی کشتوکالی بەرهـەم لەچاو سالی ١٩٥٥دا بەرێژەی ٦٤٪ زیادی کرد ٠

حکوومەتی ڤێتنامی دیموکرات یارمەتـی وولاتانـی سۆشیالیستو یەکێتی سۆڤیەتی پێ گەیشت بۆ دووبارە بنیات نانەوەی ئەو کارگەیانەی کە فەرەنسییەکان لە کاتی شەڕی رزگـاری یەکەم تێکیـان دابـوو ٠ هەروەها لەم قۆناغەدا نرخی شتومەکی بەرهەم هێنراوی کارگـە ناوخۆیی یەکان بەرێژەی ٥٤٤٪ بەرزبوەوە ، دەبینین لە سالی ١٩٥٧ ئـەم نرخە ٤٦٫٤ ملیۆن دۆنگ بوو کەچی لەسالی ١٩٥٤ بـوو بە ٥ر٣٨ ملیۆن دۆنگ هەروەها بەنیازی زالبوون بەسەر هەموو بـەرماوەیەکـی سەرمایەداریو چەوساندنەوەی سەرمایەداری لە وولاتدا ، حکوومـەت هەلسا بە دەرکردنی جۆرە دراو (عملة) یکی نوێ کە بە (دۆنگ) ناسرابوو٠

لەبارەی هاتوو چۆشەوە حکوومەت بایەخێکی زۆری بە هێلـی ئاسنینو ووشکاییو هاتوو چۆی ئاوی دا بەنیازی بەکارهێنانیـان لە خزمەتی بەرهەم هێنان ٠

سەرەرای ئەمانە حکوومەتی شۆرش هانی سەرمایەداری نشتمانی دا بۆ بەشداری کردن لە بەرهەم هێنانی پیشەسازیو بازرگانی ناوخۆو

بەشێك لە بازرگانی دەرەوە(٢٠) ٠

ئەم قۆناغە سەرەڕای دووبارە بنیات نانەوەی ئابـــووری وولات هەندێ گۆڕان کاری پێشکەوتن خوازانەشی گرتە خۆی کە بـــــــووە ڕیگا خۆش کەری گۆڕانکاری سۆشیالیستی ٠

**دووەم : ١٩٥٨ ــ ١٩٦٠ قۆناغی گۆڕانکاری سۆشیالیستی (مرحلة التحول الاشتراكـــي)**

لەم قۆناغەدا بایەخێکی زۆر بە کشتوکاڵ درا چونکە کشتوکـــاڵ بەکۆڵەکەی ژیانی ئابووری دادەنرێ ، ئەویش بەچاككردنی ڕێگـــــــە کشتوکالی‌یەکان وپتەوکردنی هەرەوەزی‌یە کشتوکالی‌یەکان ٠

ئـــەم قۆناغە وەنـــەبێت پەرەسەندنـــی بەرهەمی پیشەســـــازیو پیشەسازی‌یە دەستکردە ناوخۆیی‌یەکانی فەرامۆش کردبێت ، بەڵكـــو لە هەرەوەزی‌یەك یا ڕێکخراوێك کۆیانی دەکردەوە بۆ مەبەستی بەرهەم هێنان یان بەرهەم هێنانو بازاڕکاری ڕوونترین بەڵگەی پەرەسەندنـــــی بەرهەم هێنان لەژێر سێبەری گۆڕانکاری سۆشالیستی ئەو زیادی‌یەیە كە لە بڕی ناردنە دەرەوە دەبینرێ ٠ بەڵام هێنان (استیراد)ی هۆیەکانی بەرهەم هێنان (وسائل الانتاج) لەساڵی ١٩٦٠ دا گـەیشتبووە ٨٧٪ی سەرجەمی نرخی شتومەکە هێنراوەکان کە ئەمەش بایەخ دانـــــی شۆڕش دەگەیەنێ بەپیشەسازی قورس کە ڕێژەی هێنـــان لـــــەو

(٢٠) لە وولاتانی تازە پێگەیشتوودا (الدول النامية) کاتێك ڕژێمێکـی سۆشیالیستی دێتە سەر تەخت ناتوانرێ یەکسەر هەموو بەشەکانی بەرهەمهێنان بگۆردرێ بۆ کەرتی سۆشیالیستی (القطاع الاشتراكي) ، بەڵکو لە سەرەتادا دەبێ شانبەشانی بۆرژواکانی وولات لـــــــە بەرهەم هێناندا کاربکات ٠ بـــەڵام دوای ئەوەی ئابـــووری وولات بەڕادەیەکی زۆر چاك بەرزدەبێتەوە ئەوسـا دەبـێ سەرمایـەداران بەرەبەرە لە بەشەکانی بەرهەمهێنان پکشێنەوە ٠

شتوومەکە قورسانە کەیشتبووە ١ر٢٥٪ی سەرجەمی هێنراوەکان لەو سـاڵەدا ٠

لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٠ دا کۆنفرانسی پارت بڕیاری پلانی پێنج ساڵەی (الخطة الخمسية)ی ئاشکرا کرد کە لەسەر ئەم بناغانە بنیات نرابوو :ـ

١ ـ پەرەپێدانی پیشەسازی شان بە شانی کشتوکاڵی ، وە زیاد کردنی کارگەکانی پیشەسازی قورس‌و بایەخ دان بە ڕێگەکانی هاتووچۆ ، هەروەها بایەخ دان بە بازرگانی کە کەرتی گشتی‌و هەرەوەزییەکان (القطاع العام والتعاونيات) بەڕێوەی بەرن ٠

٢ ـ بەجێ گەیاندنی گۆڕان کاری تەواوی سۆشیالیستی لە مەیدانی کشتوکاڵداو گەشەپێدانی ئەو پیشەسازی‌و بازرگانییەی کە کەرتی تایبەتی بەڕێوەی دەبات بۆ ڕژێمێکی هەرەوەزی تەواو یا گۆڕانی بۆ کەرتی گشتی لەگەڵ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان ملکداری هەرەوەزی‌و کۆمەڵیەکان ٠

٣ ـ بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری‌و فێرکردنی گەل ، چونکە بەیەکێك لە هۆکارەکانی (وسائل) زۆرکردنی بەرهەم دادەنرێ ، وە بایەخدان بە لێکۆلینەوەی زانستی‌و پەرەپێدانی تەکنەلۆجی ٠

٤ ـ بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی چینی کرێکارو زۆرکردنی خزمەتگوزاری کۆمەلایەتی‌و خۆشگوزەرانی ، وە دامەزراندنی ژیانێکی نوێ لە شارو لادێ ٠

٥ ـ بەهێزکردنی هۆکارەکانی بەرگری سەربازی لە وولات بۆ پاراستنی دەستکەوتەکانی ئابووریو پیشەسازی بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ شـــەڕی داهاتوو کە ئامانجی گێڕانەوەی یەکێتی وولاتە ٠

لە ساڵی ١٩٦٥ کە کۆتایی بە پلانی پێنج ساڵە هات ، ڤێتنامـی دیموکراتی پێشکەوتنێکی فراوانی لە بەرهەمی پیشەسازی بەخۆیـــەوە بینی ، هەروەهـــا هەرەوەزیـیــە سۆشیـــالیستییەکـــان ( التعاونیـــات الاشتراکیة ) باڵی بەسەر بواری کشتوکاڵو کەرتی تایبەتی (قطاع خاص) بازرگانیو پیشەسازی کێشا ، جگە لەمانە کەرتی دەوڵەتیش مەرکەزی خۆی لە بەرهەم هێنانو بازارکاریو بازرگانی دەرەوەدا پتەو کرد ٠

## ڕۆشنبیریو فێرکردن

ترۆنگ شن خاوەن بیری سۆشیالیستـی پارت لـە ڤێتنامـــــی دیموکراتی دەڵێ :ـ ( ڕۆشنبیری ڕەگەزێکی گرنگە لە ڕەگەزەکـــــانی بەرگریو خۆڕاگرتن کە گەلی ڤێتنام ناچار دەکات لەژیانی ڕۆشنبیریدا لەسەر دوو هێڵی تەریب بڕوا کە ئەمانەن :ـ

١ : زاڵ بوون بەسەر پاشمـــاوەی ئـەو ئاژاوە ڕۆشنبیرییـــەی فەرەنسییەکان لە وولاتدا هێناویانەتە کایەوەو کردبوویان بە بناغـەی دوژمنکارییان بۆ سەر وولات

٢ : دامەزراندنی ڕۆشنبیرییەکی ڤێتنامی بنەڕەت کە لەگەڵ ژیانـی دیموکراتی نوێدا یەك بگرێتەوە )

بەم جۆرە (دەست گرتن بەوەی نشتمانی‌یەو دوورکەوتنەوە لەوەی بێگانەیە) بوو بە دروشمی ژیانی رۆشنبیری (٢١)

هەروەها ژیانی رۆشنبیری‌و فێرکردن لەسەر سێ بناغە دامەزرا :ـ

١ ـ دەبێ نەتەوەیی بێت ٠

٢ ـ دەبێ زانستی بێت ٠

٣ ـ دەبێ میللی بێت ٠

دیسانەوە بۆ پلانی کاری رۆشنبیری (خطة العمل الثقافي) شەش بناغە دانرا کە لەگەڵ ژیانی نوێی گەلی ڤێتنام یەك دەگرێتەوە :ـ

١ ـ هەڵسان بە هەڵمەتی راگەیاندنی چالاك لە رێگەی ئەدەب‌و هونەرەوە لە پێناوی بەرگری‌و خۆراگرتن ٠

٢ ـ کارکردن لە پێناوی قەڵاچۆ کردنی نەخوێندەواری ٠

٣ ـ بڵاوکردنەوەی بنەماکانی رۆشنبیری تەندروستی گشتی‌و خۆپاراستن لە نەخۆشی لە نێوان گەلدا ٠

٤ ـ پاکسازی پاشماوەی دەسەڵاتی فەرەنسی لە ژیانی رۆشنبیری‌دا

٥ ـ هێنانەکایەوەی رژێمێکی فێرکردنی نشتمانی کە لەسەر بناغەی زانستی‌و میللی دامەزرابێت ٠

---

(٢١) مەبەست لەم دروشمە ئەوە نی‌یە کە گەلی ڤێتنام بە دابڕاوی بمێنێتەوە لە شارستانی گەلانی جیهان ، بەڵکو مەبەست دوور کەوتنەوەیە لە هەموو ئەو ئەنجامە خراپانەی کە بەهۆی شارستانی بێگانەوە تووشی بوونە ٠ وە هیچ کاتێك رێگا ناگرێ لە کارلێکردن لەگەڵ شارستانی گەلانی جیهان‌و سوود وەرگرتن لە لایەنە ئیجابی‌یەکان ٠

٦ ـ کارکردن لە پێناوی وەرگرتنی ئەو بەشە لەژیانــی رۆشنبیری بێگانە کە سوودی بۆ ژیانی کۆمەڵ هەبێتو لەگەڵ بیروباوەڕیدا یەك بگرێتەوە ، بێ ئەوەی کار لە گەسایەتی ڤێتنامی نوێ بکـــات ٠

ئەمە ئەو رێبازو دروشمانە بوون کە لایەنی رۆشنبیری و فێرکردنی لەسەر بنیات نرابوو بۆ پەرەپێدانی ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی لە ڤێتنــــامی باکـــــوور ٠

کار لە قۆناغەکانی بنیات نان و گۆڕانکاری سۆشیالیستی و پلانــی پێنج ساڵە هەر بەردەوام بوو بۆ بلاوکردنەوەی ڕۆشنبیری بە شێوەیەکی خێرا ، ئەوەبوو ژمارەی قوتابخانەکان لە سالانی ١٩٦٥/١٩٦٦ گەیشتــە نزیکە ٩٣٠٠ قوتابخانە کــە نزیکــە ٠٠٠/٢ر٦٧٤ قوتابــی گرتبـــووە خۆی٠ئەم قوتابخانانە زۆر بە ڕێکی دابەش کرانبەجۆرێك بتوانێت خزمەتی تەواوی کۆمبۆنە جیاوازەکان بکات ، بەجۆرێك هــــەر کۆمبۆنێـــك قوتابخانەیەکی سەرەتایی گشتی بەر دەکـــەوێو هەرسێ کۆمبـــۆن قوتانجانەیەکی ناوەندی تیا دەکرێتەوە ، وە هەر مەلبەندێـــــك قوتابخانەیەکی دوا ناوەندی تیا دادەمەزرێت ٠

فێر کردنی سەرەتایی بەزۆر بوو ، هەندێ لە بەرێوبەرایەتــــی توتابخانەکانی دەلتا ١٠٠٪ی ئەوقوتابیانەیان گرتە خۆ کە گەیشتبوونــە تەمەنی خوێندن ٠ ژمارەی ئەو قوتابییانەی لە قوتابخانەکان دەیانخوێند گەیشتە پێنج بەقەد ژمارەی ئەو قوتابییانەی لەپێش شەڕی جیهانی ووەم بەفێتنام دەیان خوێند ٠ لەسایەی حکوومەتی سۆشیالیستییــەوە ڤێتنــام لەخوێندنی بالادا (التعليم العالي) پێشکەوتنێکی دیاری بەخۆیەوە بینــی ، ئەوەبوو ژمارەی قوتابیانی پەیمانگا بالاکان (المعاهد العليا) لە ســالــی ١٩٦٢دا گــەیشتە ٢٦٣٠٠ قوتابی کوڕوکچ کەچـی لەسالـــــی

١٩٣٩ ژمارەی قوتابیان بە کوڕو کچەوە لـە سەراپـای هیندی چینـــی (فیێتنام) ، کەمبۆدیا ، لاووس ، ٦٠٠ قوتابی بوو • هەروەها حکوومـەت بایەخی بە خوێندنی هونەریو مەشق پێکردنی پیشەییدا ، لە ســـالی ١٩٦٤ ژمارەی قوتابخانەکانی فێر کردنی هونەری مـەلبەندەکانـی مەشق پێکردن گەیشتە ١٢٨ قوتابخانە کە ٣٥٦٠٠ قوتابی دەگرت •

سەرەڕای ئەم بلاوبوونەوە مەزنەی فێرکردنی ژمارەی نەخوێندەواران لە سالی ١٩٤٥ ـ ١٩٦٥ گەیشتە ٣ ملیۆن کەس کە تەمەنیان لە نێـــوان ١٢ ـ ٥٠ سال دەبـــوو •

ئەم گۆڕانەی مەیدانی فێرکردنی تەنها لایەنە چەندێتییەکـــــەی (کمية) نەگرتەوە ، بەلکو پرۆگرامی فێرکردنیشی گرتـەوە بە شێـوەیەك کە خزمەتی ئامانجو دەستکەوتەکانی شۆڕش بکات • هەروەها بایـــــەخ بە خوێندنی زمانی نەتەوەیی ومێژوویی نەتەوە درا ، بەجۆرێك توانـــرا خوێندن بەکار بهێنرێ بۆ خزمەتی ئامانجەکانی پەرەپێدانـی ئـابووریو دەستەبەرکردنی دەستی کرێکاری هونەری لێهاتوو بۆ کارکردن لــــە بوارە جیاوازەکانی پیشەسازیو کشتوکال •

سەرەڕای ئەمانە حکومەت دەرگای قوتابخانەکانی بـــۆ نـــەوەی کرێکارو جوتیارو پیاوانی سوپا خستە سەر پشت کە بە درێژایی سەردەمی ئیمپریالیستی لەم مافە بێبەش بوون • لە سالی ١٩٦٤دا ٩٠٪ی نـــاو نووسراوەکانی قوتابخانەکانی نەوەی کرێکارانو جوتیاران بوون ، ئەوەی ماوەتەوە کوڕی بەڕێوەبەرانی حکوومەتو خـاوەن پیشەکـانو پاشماوەی سەرمایەدارە نشتمانییەکان بوون • هەرچەندە فرۆکەکانی ئەمریکـــا

بێووچان لادێو شارەکانی ڤیێتنامی دیموکراتیان وێران دەکرد گەل هـەر سوربوو لەسەر بەردەوام بوونی ژیانی سروشتی لەگـەڵ خۆڕاهێنـــان لەگەڵ ژیانی بۆردومان کاری فرۆکەکانی ئەمریکــــا ٠

سەرباری بۆردومانی فرۆکەکان لەسەر شارو گوندەکانی ڤیێتنــــامی دیموکرات ، خوێندن لە پێشکەوتنی خۆی نەکەوت بەجۆرێــك ژمـــارەی ناونووسراوەکانی قوتابخانەکان لەساڵی ١٩٦٧ دا بەڕێژەی ١٣٠٪ نەچاو ساڵی ١٩٦٥دا زیادی کرد ، هەروەها خوێندن بوو بە هۆیەك بۆ خزمـەت کردنی پێشکەوتنی ئابووریو کۆمەڵایەتی ٠

ئەدەبو هونەریش لە ئاستی مەسەلەگەدا دوورەپەرێز نەوەستـــان ، بە ڵکو ئەدیبو هونەرمەندانی ڤیێتنام هەموو توانایەکیان بۆ خزمەتـــی ڕێبازە نوێکان خستە کار بۆ زیندوو کردنەوەی کەسایەتـی ڤیێتنــــامیو پاك‌کردنەوەی مێشکیان لە پاشماوەی سەردەمی ئیمپریالیستی ، ئەویشـ بە بەکارهێنانی زمانـی نشتمانی وەکـو هۆیەك بـۆ دەربڕینی ئــــەدەبی هەستی نشتمانی ٠

هێرشی فرۆکەکانی ئەمریکا بۆ سەر ڤیێتنامی دیموکرات هۆیەکـی کاریگەر بوو بۆ سەر ژیانی نووسەرانو شاعیرانو هونەرمەندان ، چونکە وای لێ‌کردن هەموو توانایەکیان بۆ خزمەتی شەڕ دژی دەست درێژکەران تەرخان بکەن ٠

سەرکەوتنەکانی ڤیێتنامو شکانەکانی ئەمریکا لەو بابەتە نوێیانـــــە بوون کە خۆیان ئاخنیە ناو شیعری شاعیرانو چیرۆکی چیرۆك نووسان٠ نووسەرانی ڤیێتنام هەرگیز زیندوو کردنەوەی کەلەپـووری نشتمانـیو پاڵەوانە مێژوویی‌یەکانی گەلی ڤیێتنامیان لەیاد نەکردووە ، هەروەهـــا

نووسەران هەولی ئاراستەکردنی بیری میللی‌یان دا بـۆ ژیانـی سۆشیالیستی‌و دیموکراتی نوێ • جگە لەمانە حکوومەت هەلسا بـە دروست‌کردنی تیپێکـی هونەری میللی کـە لە سالانـی ١٩٦٣/١٩٦٤ بەگشت جیهاندا خولیان خواردەوە بۆ ناساندنی واقعی میللەتەکـەیان‌و سیفەتە مرۆڤایەتی‌یەکانی نەتەوەکانی جیهـان •

سەرەڕای ئەمانە حکوومەت توانی سەربکەوێ لە دانانی سینەمایەکی نشتمانی بۆ چاپ‌کردن‌و پیشان‌دانی ئەو فیلمانە کە ژیانی نوێی گـەلی ڤیێتنام دەخاتە ڕوو • بەم جۆرە توانرا ئەم سینەمایە بۆ خزمەتی هەلمەتی ڕاگەیاندنی ناوخۆ (حملة الاعلام الداخلي) بەکار بهێنرێ کە ئامانجـی ئاراستەکـردنـی بیری میللی‌یە بـەرەو بیروباوەڕی سۆشیالیستـی‌و دیموکراتی نوێ • هەروەها ئەم سینەمایە لە ئیعلامی دەرەوەشـدا بەکار هێنرا بۆ ڕاکێشانی ڕای گشتی جیهان بۆ ریزی مەسەلەی یەکێتـی ڤیێتنـام‌و پال‌پشت کـردنی گـەل دژی ئامانجـە ئیمپریالیستـی‌و دوژمنکاری‌یەکانی ئەمریکـا •

کاتێك باسی شیعرو شاعیری ڤیێتنامی دێتە پێش یەکسەر پەنجە بۆ شاعیری هەلکەوتوو (توهوو جیانگ نام) درێژدەکەین ، وە لـە نووسەرانی چیرۆکی واقعی (کوانگ دۆنگ)و (ڤان شان لو) باشتریـن نموونەن ، کە هەموویان لەسەر زەوی شەڕو لادێ‌و شارو ئەو شوێنانە دەیان نووسی کە بۆردوومان کرابوون • لە سەردانەکانیان‌دا بـۆ ناوچە ڕزگارکراوەکانی ڤیێتنامی خوارووا هەستی تەواویان بـۆ گەلەکەیان دەگواستەوە کە گیانی بەرگری‌کردنیان تیا هەلئەستا بـۆ ڕوو بەڕوو بوونی ئەمریکای دوژمن ، وە هیوای سەرکەوتنیان دەخستە دلی گەلـەوە •

# ژیان لە ڤیێتنامی خوارووودا

## ژیانی ڕامیاری

هەر لە ساڵی ١٩٥٤ەوە ڤیێتنامی خوارووو ڕوو بەڕووی ژمارەیەك گۆڕانی سیاسی بوو کە ئەمانەن .

١ ـ سەرنەکەوتنی باودای لە ڕاکێشانی گەل بەرەو خۆی ، ئەویش لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەی لە حوکم و لێ نەهاتوویی و خراپی ڕەووشتی .

٢ ـ لاوازی پۆلیس و سوپا ، هەروەها قینی جەنەراڵە گەورەکان لە سەرەك وەزیران .

٣ ـ ڕێكخستنی بەڕێوەبردن متمانەی دەکردە سەر پۆلیس و سوپا کە بە شێوەیەکی ئیقلیمی یا ئایینی دروست ببوو ، هەروەها چەتەیەك حوکمرانی دەکرد کە ناوی (بینا ئکسوین) بوو ، هەڵئەسا بە کاری چەتەیی لە سایگۆنی پایتەخت بەرامبەر بەرتیل دان بە ئیمپراتۆر باودای

٤ ـ لە ساڵی ١٩٥٥ کودەتایەك دژی دەسەلاتی (بیناێکسوین) کە لە ئەنجامدا قەسابخانەیەکی گەورە لە شەقامەکانی سایگۆنی پایتەخت بەرپا بوو کە بە دەسەلات گرتنە دەست لەلایەنی سوپاوە کۆتایی هات

٥ ـ (نجودن دیم)(٢٢) دەستی کرد بە لاواز کردنی تایەفە ئایینییە نیشتمانی یەکان ، لەهەمان کاتدا هانی کاثۆلیکییەکانی وەدا بۆ

---

(٢٢) لەساڵی ١٩٢٩ دا فەرەنسییەکان (نجودن دیم) یان کرد بە حاکمی ولایەتی (فان فیت) ، پاشان لە ساڵی ١٩٣٣ کرا بە وەزیری ناوخۆ ،وە لە ساڵی ١٩٤٩ پارتی نیشتمانی موحافیزینی دامەزراند کە هەموو کاثۆلیکییەکانی گرتە خۆی ، بەڵام زۆری نەبرد ئەم پارتە هەڵوەشایەوەو لە ساڵی ١٩٥١ بەرەو ئەمریکا ڕۆی . لەوێدا لەگەڵ پیاوە گەورەکان وتووێژی کردو پەیمانی دانێ کە هەموو هەوڵێکی دژی جوولانەوەی کۆمۆنیستی تەرخان بکات .

بەهێزکردنی مەرکەزی خۆیان لە دەولەتدا لە کاتێکا ئەم کاثۆلیکانە ١٠٪ی دانیشتوان پێك دێنن ٠

٦ ــ چالاکی دەستەی (هواهاو) زیادی کرد تائەوەبوو توانی سەربەخۆیی خۆیان لە ناوچەیەکی ناوەڕاستی ڤیێتنامی خواروو بەدەست بهێنن ، هەروەها توانی دەستەکانی کاودای بەرەو سوپای میری رابکێشن ٠

٧ ــ لەگرنگترین ئەو ڕووداوانەی کە دوای کۆنفرانسی جنێف لە ڤیێتنامی خوارووداروویدا ، کشانەوەی فەرەنسا بوو لە نیسانی سالی ١٩٥٦ ، دوای ئەم سالە ئیتر ئەمریکا دەستی خستە ناو ڤیێتنامەوە ٠

هەلبژاردنەکانی ٢٣ی تشرینی یەکەمی سالی ١٩٥٥ بە دامەزراندنی نجودن دیم ) بە سەرەك کۆماری ڤیێتنام بۆ ماوەی پێنج سال کۆتایی هات ٠ وە لە ٩ی نیسانی سالی ١٩٦١ بۆ ماوەی پێنج سالی تر بەسەرەك کۆمار هەلبژێردرایەوە ٠ بەلام لە سالی ١٩٦٣ گیروگرفتی ترسناك سەری هەلدا کە تیایدا بوذییەکان حکومەتیان تاوانبار کرد بە بەکارهێنانی رەگەزپەرستی و کاری دژوارو لێدانو کوشتن ، ئەمەش بووە هۆی ڕوودانی کودەتایەك لە رۆژانی ١ــ٢ تشرینی دووەم دا کە کۆتایی بەحوکمی (نجودن دیم) هێناو لە ئەنجامدا خۆیو براکەیو راوێژکارە سیاسییەکەی کوژران ، وە حکومەتێکی کاتی بەسەرۆکایەتی (دۆنگ ڤان من) دروست بوو ٠

پاش ئەمانە ڤیێتنام تووشی گەلێك کودەتای یەك لەدوای یەك دەبوو ٠ جەنەڕال (نجوین خان) توانی لە ٣٠ی کانوونی دووەمی سالی ١٩٦٤ دەست بگرێ بەسەر حوکمدا ، بەلام لە ٢٢ی ئابی سالی ١٩٦٤ دکتۆر (نجوین

نكسوان ئاوان) حوكمەكەی پێشووی رووخانو خـۆی سەرۆكایەتـــی وەزیرانی گرتە دەست • دوای ئەوە لە ٤ی ئەیلوولی هەمان ساڵدا (نجوین خان) توانی بگەرێتەوە بۆ سەر حوكم •

پێش تێپەربوونی ١٠ رۆژ بەسەر ئەم كودەتایە جەنەڕاڵ (لان فـــــان) هەوڵی كودەتایەكی فراوانی دا بەڵام سەرنەكەوت •دوای مانگێك ئاغـای سایگۆن (تران فان هۆنگ) هەڵسا بە جووڵانەوەیەك كە جێگەی (خـان)ی گرتەوەو بوو بە سەرەك وەزیران ،وە خانیش كرا بە سەرەك كۆمارێكـی ڕووكەش • جووڵانەوەكانی كودەتا هەر بەردەوام بوو ، ئەوەبوو لـــە

كانوونی دووەمی‌ساڵی ١٩٦٥ دا (خان) توانی دەسەڵاتی خۆی بگێرێتەوەو ببێ بە سەرەك وەزیران • مانگێك تێپەر نەببوو لە ١٦ی شوباتدا (فان هوی كوات) وەزارەتی گرتو (خان)ی ناچار كرد كە لە ٢١ی شوبات واز لە سەرۆكایەتی بهێنێ • لە حوزەیرانی هەمان ساڵدا كودەتایەكی نـــوێ روویدا كە تیایدا حوكمی (فان هوی كوات)ی تیاچوو و جەنەڕاڵ (نجوین كاوكای) جێگەی گرتەوە • كاوكای تا ساڵی ١٩٦٦ لەسەر حوكمی خـۆی بەردەوام بوو كە دووبارە بوذییەكان حوكمیان گرتەوە دەست •

ئامانجی شۆرشی یەكەمی بوذییەكان دژی (نجوین دیم)و دەسەڵاتی كاثۆلیك بوو ، بەڵام شۆرشی دووەم دژی خەڵكی لادێكان دەیانكرد • هەروەها هەندێ لە سەرۆكە بوذییەكانی وەك (تری كوانگ ، شام شـاو) دژی رژێمی كۆمۆنیستیش بوون ، وە دەیانوویست ڤێتنامی خواروو لـــە ئێتنامی باكوور كە پارتی كۆمۆنیست حوكمی تیا ئەكات بپارێزن • ئـــەم سەرۆكانە رێكخراوێكیان بەناوی (فین تانگ ثۆنگ) پێك هێنا كـــــە سەرۆكایەتی بزوتنەوەی سیاسی بوذییەكانی دەكرد كە٧٠٪ی دانیشتوانی ئێتنامی خواروو پێك دێنن •

شان بەشانی ئەم کارانــە ئەم ڕێکخــراوە کــاروباری ڕۆشنبیری و ئایینیشی دەبرد بەڕێـــــوە ٠

بەم جۆرە دەبینین کە ڤیێتنامی خوارروو هەر لە ئایاری سالی ١٩٦١ەوە تا ئازاری سالی ١٩٦٦ واتە لە ماوەی سێ ساڵدا ١٢ کودەتــاو دوو

گیرو گرفتی گەورەی تیا روویدا کە لە ئەنجامدا بزوتنەوەی سیاسی بوذی یەکان سەری هەڵــــدا ٠

دەبێ هەرگیز ئەوە نەخەینە پشت گوێ کە ئەم بارە ناجێگیــــــرو شلەژاوە دەگەڕێتەوە بۆ دەستخستنی ئەمریکا لە کاروباری ناوخــــۆی ڤیێتنامی خــــواروو ٠

## ـ دەستخستنی ئەمریکا لە کاروباری ناوخۆی ڤیێتنام ـ

هاتنی ئەمریکا بۆ ڤیێتنام بە ڕووداوێکی سەیر دانانرێ ، چونکــە لەدوای شەڕەوە نیازی ئەمریکا لەم دوو خاڵەدا کۆبۆوە :ـ

١ ـ فەرەنسا لە بەڕێوەبردندا جێگەی متمانە نی یە ، سەرەڕای ئەو پارمەتی یە زۆرەی دەیدرێتێ تواناى گێڕانەوەی دەسەڵاتی لە هیندی چینیدا نیە ٠

٢ ـ لەدەست چوونی هەر بەشێك لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو سەرکەوتنی کۆمۆنیستی تیایدا مانای لەدەست چوونی هەموو ناوچەکــەو ئابڕوو چوونی جیهانی ڕۆژئاوا دەگەیەنێت ٠

---

لە سالی ١٩٥٠دا کۆمۆنیستی بەتەواوی لەچینـــدا سەرکـــەوتو هێزەکانی ماوتسی تۆنگ گەیشتە سنووری باکووری ڤیێتنام ٠ ئـــــەم

رووداوه ڕای ئەمریكای بەپەلە كۆرییو وای بەبیردا هات كە یارمەتیی دانی فەرەنسا تەنها بە پارە سوود ناگەیەنێ بۆ بەردەوام بوون لەسەر شەڕ • بۆ ئەم مەبەستە داوای لە نوێنەرانی پەیمانی ئەتلەنتی (حلف الاطلسي) كرد بۆ كۆبوونەوە لە كانوونی یەكەمی سالی ١٩٥٢ بۆ یارمەتی دانی فەرەنسا یارمەتی دانێكی سەربازی • لە ئایاری سالی ١٩٥٣ ئایزنهاوەر ووتارێكی بۆ كۆنگرسی ئەمریكادا ، تیایدا باسی بەرژەوەندی ئەمریكای كرد لە كۆمەك كردنی فەرەنسا كۆمەك كردنێكی سەربازی ، بەلام فەرەنسا گارەزووی ئەم كارەی نەبوو ، بۆیە تەنها داوای یارمەتی ماددی كرد •

لەسالی ١٩٥٣/١٩٥٤ ئەمریكا هەولی گواستنەوەی مەسەلەی هیندی دا بۆ ئاستێكی دەولەتی بەمەبەستی پاراستنی جیهانی رۆژئاوا لە شۆرشی كومۆنیستی • لە ئەنجامی رازی نەبوونی فەرەنسا بەهاتنی سوپای ئەمریكی بۆ ڤیێتنام ، جۆن فۆستەر دالاس (خوێن مژێكی ئەمریكییە ف•هـم) •

ئاشكرای كرد كە لە سیاسەتی ئەمریكا بەجێهێشتنی مەیدانی شەڕە بۆ ڤیێتنامیو فەرەنسییەكان ، وە ئەگەر چین سوپای بۆ یارمەتی ڤیێتنامییەكان نارد ئەویش ناچار دەبێ سوپای خۆی بنێرێ •

دوای دەرچوونی دوا بڕیاری كۆنفرانسی جنێڤ،وولاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا جاڕیدا كەتەنها دەست بە برگەی ١٣ی بەیاننامەكەوە دەگرێ كە دەقەكەی بریتییە لە كاركردن بە هەموو هۆیەك بۆ پاراستنی ئاشتیو هێمنی •

دالاس دەستی كرد بە هەولدان بۆ هێنانەدی جۆرە كارێكی هاوبەش لە ڤیێتنام ،بۆ ئەم كارە گلاوەی لە ١٤ی نیسانی سالی ١٩٥٤دا

ووتارێکی بۆ تشەرشل (سەرەك وەزیرانی ئەوسای بەریتاینا بوو ف٠هـ٠م)
نارد ، تیایدا پێشنیاری دامەزراندنی جۆرە هاوکاری یەکی کرد لە نێوان
ئینگلتەرەو فەرەنساو ئەمریکا ، هەروەها لەسەر وولاتانی باشووری
رۆژهەلاتی ئاسیا کە بەدەوری ناوچەکەوەن وەك ئوسترالیا ، نیوزلەندە
، تایلاند ، فلیپین پێویستە دەست بخەنە کارەکەوە بۆ پاراستنی
ناوچەکە لە هەرەشەی کۆمۆنیستی ٠ چەرچلیش بەوە بەرپەچی دایەوە
کە ناتوانێ هیچ جۆرە کارێکی هاوبەشی بکات ، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە
هەموو جۆرە هیوایەك لە ووتووێژ دەبرێ ، هەروەها دەست ناخاتە
کاروباری کەسەوە تەنها بەپێی ئیرادەو توانای خۆی نەبێت ٠ ئەم
ووتارەی چەرچل بەسەرنەکەوتنی یەکەم هەولدانی ئەمریکا دادەنرێ بۆ
هەلسان بەدەست خستنی هاوبەش لە کاروباری ناوخۆی ڤێتنامدا ٠

ئایزنهاوەر (سەرۆکی ئەوسای ئەمریکا بوو ـف٠هـ٠م) وای بە
خەیالداهات کە بەبێ هاوبەشی بەریتانیا دەتوانێت ئەم کارە بکات بەمەرجێ
ئوسترالیاو نیوزلەندەو هەندێ لە وولاتانی ئاسیایی وەك پاکستان و
بۆرماو سیلان بەشداری تیا بکەن ٠ بەم شێوەیە لە ١٧ی ئایار (لەکاتی
بەستنی کۆنگرەی جنێف) پەیمانێکی سێ قۆلی بەناوی پەیمانی
(SU. ZN. A) لە نێوان ئەمریکاو ئوسترالیاو نیوزلەندە بەسترا
کە بریاری دەستخستنە کاروباری ناوخۆی ڤێتنامیان دەرکرد ٠ ئەمریکا
دەستی بە جێبەجێکردنی کارە چەپەلەکەی کرد ، کە بەو یارمەتی یانە
دەستی پێکرد کە پێشکەشی حکومەتی (نجودن دیم)ی بەکرێگیراوی
ئەکرد لە ڤێتنامی خوارووودا ٠

دوای کشانەوەی هێزەکانی فەرەنسا لە ٢٦ی نیسانی سالی ١٩٥٦دا
دەستەیەکی ئەمریکی بەناوی (دەستەی راوێژکار بۆ یارمەتی دانی

سەربازی) جێگەی گرتەوە • ئەم دەستەیە لە ساڵی ۱۹۵۰ وە دروست بووە بۆ پێشکەش کردنی یارمەتی ماددی بۆ هێزە شەڕکەرەکانی فەرەنسا لە ڤێتنام • لە ماوەی نێوان کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۵۵ ەوە تا تەمموزی ساڵی ۱۹۵٦ هێزو پاپۆرو پیادەو دەریاییەکانی ئەمریکا لە بەندەرو شارەکانی ڤێتنامی خواروو دائەبەزینو تیایدا بەئارەزووی خۆیانە دەگەڕان ، ئەچوونە ناو وولاتو دەرئەچوون بێ ئەوەی کۆسپێ بێتە ڕێگەیان • لە ساڵی ۱۹۵٦ ەوە هاتنی سەربازی ئەمریکی لە دەستە جیاوازەکانەوە دەستی پێ کرد بەشێوەی مەشق پێکەرێك یا راوێژکارێك یا هەرشتێکی تر بە مەبەستی خۆ گەیاندن بە سوپای ڤێتنامی خواروو • هەروەها ئەمریکا گوێی نەدا بە دەقی رێکەوتنامەی هودنە کە قەدەغەی بەشداری کردن دەکات لە هەموو پەیمانێکی سەربازی ، هەروەها قەدەغەی وەرگرتنی یارمەتی سەربازی بێگانە ئەکات • بەم جۆرە ئەمریکا ژمارەیەکی زۆر چەكو شتوومەکی جەنگی بۆ سوپای ڤێتنامی خوارووی سەر بە حکوومەتی — دیم — نارد •

شۆڕشگێرانی گەل تا ساڵی ۱۹۵٦ دەستیان بەسەر سێ یەکی وولاتدا گرتبوو و ژمارەیەکی زۆریان لە بنکەکان داگیرکردبوو • سەرۆکی راوێژکەرانی ئەمریکا داوای لە وولاتە یەکگرتووەکان کرد کە بەرووبی فریایان بکەوێت بە هۆی ئەو گیرو گرفتانەی حکوومەتی ڤێتنامی خواروو توشی بووەو هەڕەشە لە بوونی دەکات • بەڵام وولاتە یەکگرتووەکان تەنها بە مەشق پێکردنی هێزەکانی حکوومەت • وە دەست گیرۆکردنیان بە یارمەتی ماددیو ئازووقەوە وەستا •

لە ساڵی ۱۹٦۱ دا جۆن کەنەدی سەرەك کۆماری ئەمریکا ووتارێکی لە — دیم — ی سەرەك وەزیرانی ڤێتنامی خوارووەو پێگەیشت کە تیایدا داوای یارمەتی لە حکوومەتی ئەمریکا کرد لە دژی ئەو چالاکییانەی

بەرامبەر حکوومەت دەکرێ ، ئەو چالاکی‌یانەش حکوومەتی ڤیێتنامی باکوور یارمەتی‌یان دەدات • جۆن کەنەدیش بەم شێوەیە پەرپەچی دایەوە : سەرەڕای بەشداری نەکردنی وولاتە یەکگرتووەکان لە رێکەو تنسامەی جنێفو دوا بڕیاری کۆنفرانسەکە سەیری تازە بوونەوەی دوژمنایەتی‌یەکە دەکات وەکو هەڕەشەیەك لە ئاشتی جیهان ،وە ئامادەیی خۆی دەردەخات بۆ یارمەتی‌دانی کۆماری ڤیێتنامی خواروو بۆ پاراستنی گەل‌و سەربەخۆیی‌یەکەی • لەبەر ئەوە وولاتە یەکگرتووەکان یارمەتی سەربازی بۆ ڤیێتنامی خواروو زیاد دەکات ، ئەمە سەرباری ئەو یارمەتی‌یانەی دەیدات بۆ چاك کردنی ئەو وێران کاری‌یەی بە لافاو تووشی بووە • جۆن کەنەدی ووتارەکەی بە پێشکەش کردنی چەند ڕێنوینی‌یەك (تعليمات) بۆ دانانی بەرنامەیەکی تایبەت بەم کارەوە کۆتایی پێ هێنا •

ابێ ئەوەی بچینە ناو درێژەی رووداوەکانەوە ئەم خشتەیەی لای خوارەوە دەخەینە ڕوو کە پەرەسەندنی ژمارەی هێزەکانی ئەمریکا لە ڤیێتنامی خواروو دەردەخات :ـ

| مانگ | ساڵ | ژمارەی هێزەکانی ئەمریکا |
|---|---|---|
| | ١٩٦١ | ١٣٠٠ |
| | ١٩٦٢ | ١٠ر٠٠٠ |
| | ١٩٦٣ | ١٦ر٠٠٠ |
| | ١٩٦٤ | ٢٣ر٠٠٠ |
| ئایار | ١٩٦٥ | ٣٤ر٠٠٠ |
| ئەیلوول | ١٩٦٥ | ١٢٥ر٠٠٠ |
| تشرینی یەکەم | ١٩٦٥ | ١٦٥ر٠٠٠ |
| تەمموز | ١٩٦٦ | ٢٨٠ر٠٠٠ |

ئەم ژمارەیە لە ماوەی ساڵی ١٩٦٧/١٩٦٨ گەیشتە زیاتر لە نیو ملیۆن سەرباز ٠ شان بەشانی ئەم هێزانە هێزی فلیپینی و ئوسترالی و نیوزلەندیش رووی لە ڤێتنام کرد ٠ هێزەکانی ئەمریکاو هێزە بچووکەکانی فلیپین و ئوسترالیاو نیوزلەندەو هێزەکانی حکومەتی ڤێتنامی باشوور هەلسان بە شەڕێك دژی گەلی ڤێتنام کە تەنها بەوە وەسیف دەکرێ کە شەڕێکی نامرۆڤانەیەو ئامانجی گلاوی تیا بەدی دەکرێ لە ئەنجامدا لاپەڕەیەکی رەشیان لە مێژوو تۆمار کرد کە بۆ هەتاهەتا نەفرەتی مێژوویان بە ناوچەوانەوە دیارە ٠

بەدەست تێوەردانی ئەمریکا لە کاروباری ڤێتنام ، گەل نەیتوانی بەو هەڵبژاردنە هەڵسێ کە دوابڕیاری کۆنفرانسی جنێف بڕیاری لەسەر دابوو ، کە ئەمەش ئیهانەیە بۆ ئیرادەی ئەو دەوڵەتانەی لەسەر کۆنفرانسی جنیف رێکەوتوون ، هەروەها ئیهانەیە بۆ گەلی ڤێتنام لە دیاری کردنی چارەنووس ، ئیهانەیە بۆ ساکارترین شێوەی ئازادی کە ئازادی گەلە لە هەڵبژاردنی ئەو رێگەیەی لەسەری دەڕوات ٠

ئامانجی ئەم کارەی ئەمریکا هەروەك سەرەك حکومەتەکانیان لە دوای شەڕی جیهانی دووەمەوە ئاشکرایان کرد وەستاندنی مەترسی کۆمۆنیستی یە ٠ لێرەدا پرسیارێك سەر قیت دەکاتەوەو دەڵێ : کام مەترسی لەم پارچەیەدا هەڕەشەی لە ئەمریکا دەکرد کە هەزاران میل لێوەی دوورەو ئوقیانووسی هێمن هەردوکیان لێك جیا ئەکاتەوە ٠

ئەم کردەوەیەی ئەمریکا ئیرادەی سەرمایەدارە زایۆنی یە دەسەلاتدارەکان بوو ٠ ئەم سیاسەتە هیچ سوودێکی گەلی ئەمریکای تیا نەبوو وە هیچ کاتێکیش گەلی ئەمریکا بەم ئیشە نامرۆڤایەتی یە ڕازی نەبوون کە بە رشتنی خوێنی گەل کارگەی سەرمایەدارە زایۆنیستەکانیش پێ دەکرێ ٠

ئەمریکا بەکوشندەترین چەك شەڕی دەکرد : بەناپاڵم‌و گـــازی زەهراوی کێڵگەکانیان خاپوور ئەکرد لادێکانیان ئەسووتان بەزەیی‌یان بە منداڵی کۆرپەشدا نەئەهات‌و دەیان‌کوشت ، لاوەکان بەکۆمەڵ دەدرانە بەر ڕێژەی گوللەی بەکرێگیراوان • هەموو ئەم هۆیانەی بەکـــــار ئەهێنا بۆ ئەوەی گەلی ڤێتنام خۆی بداتە دەست دەسەڵاتی ئەمریکـــاو بەکرێ گیراوانەوە •

## ژیانی ئابووری لە باشووردا

ڤێتنامی باشوور بەتایبەتی ئەو بەشەی کە پێی دەڵێن (نامبـــۆ) بە پیت‌ترین ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیایە بۆ بەرهەم هێنـــانی مەرمزە • لە سەردەمی داگیرکەری فەرەنسی‌دا پێویستی بەکارهێنانـــی ناوخۆی دابین ئەکردو ناتەواوی بەشی باکووری ڤێتنامی پڕدەکردەوە هەروەها بەیەکێك لەو ناوچانە دەژمێردرا کە برنجی لێ زیاد دەبـــوو و بۆ دەرەوەی دەنارد •

بەڵام بە هۆی حکوومەتی بەکرێ گیراوی خوارو ، وە لە ئەنجامی دەست‌خستنی ئەمریکا لە کاروباری ناوخۆی ڤێتنام ، هەروەهـــــا بەکارهێنانی گرتن‌و لێدان‌و کوشتن ،وە گەڕانەوەی [illegible]بەگایەتـــی بۆ لادێکان بە شێوەیەکی خراپتر لەباری پێشووی [illegible] هۆیانە کاری لە بەرهەمی برنج کردو نزمی کردەوە • لەساڵی ١٩٥٧/١٩٥٨ بەرهەمـی برنج ٩٠٪ی بەرهەمی برنج بوو لەچاو ساڵی ١٩٤٢/١٩٤٣ ، کـــە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بەرهەمی برنج زیـادی نــــەدەکرد سەرەڕای ئەو پرۆژە زۆرانەی بەیارمەتی ئـەمریکا دروست‌دەکـرا • پایەخ‌دانی حکومەت بە زۆرکردنی بەرهەم‌هێنـان بەتایبەتی برنـــج

دەگەرێتەوە بۆ هۆیەکی زۆر ڕوون کە ڕۆژنامەی تایمز لە ژمـــــارەی ڕۆژی ١٣ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٨ دەری خستووەو دەڵێ :

( مەبەستی ئەمریکا لە یارمەتی‌یەکانی بۆ ڤێتنامی خـــــــوارووو فراوان‌کردنی کشتوکاڵی برنج نیە لە ناوچەی نامبۆ ، چونکە لــــەم ساڵانەی دواییدا ئەمریکا بوو بە یەکێك لە وولاتە گرنگەکانی ناردنـــە دەرەوەی برنج) ٠

هەمان شت بۆ لاستێك (مطاط) دەووترێ کە بە دووەم بەرهەمـی ڤێتنام دادەگرێ‌و بەشێکی زۆری لێ دەنێردرێتە دەرەوە ٠ لەژێـــــر سایەی حوکمی بەکرێ‌گیراودا ڕێژەی ناردنە دەرەوەی لاستیك لەساڵـی ١٩٦٥ دا گەیشتە ٥٠٪ لەچاو ساڵی ١٩٦٣ ٠ بەرهەمەکانی تـــری کشتوکاڵ هەمان ئەنجامیان بەخۆیانەوە بینی ، وە هیچ بەشتێکـــــی سەیر دانانرێ بۆ ئەو بـارەی ڤێتنامی خـواروو تیایدا دەژیا کــــە ئەمریکایی‌یەکان کێڵگەو دارستانە کانیان‌کردبوو بە مەیدانی شــــەڕە ناڕەواکەیان ، لە جیاتی ئەوەی ئەو زەوی‌یانە بکـرێ بـە کشتوکاڵ‌و پێویستی‌یەکانی گەلی پێ دابین بکرێ ٠ لەبارەی پیشەسازیشەوە دەتوانین بڵێین کە پیشەسازی تەنها لەو شارانەدا خۆی مەڵاس دابوو کە ملکەچی دەسەڵاتی حکومەتی بەکرێ گیراوو هێزی سەربازی ئەمریکا بوو ٠ بەڵام لە شارەکانی تردا بەهۆی زرووفی شەڕو نەبوونی سیاسەتێکی جێگیـر لە ڤێتنامی خوارووداپیشەسازی لە گەشەکردن وەستابوو ٠ ناوچـــــە ڕزگارکراوەکانیش کە لەژێر دەستی بەرەی ڕزگاری خوازی ڤێتنامـــــی خوارووبوو هەمیشە فرۆکەکانی ئەمریکاو سوپای سەربازی بەکرێ‌گیراو بە بۆردومان‌و تۆپ باران هەڕەشەیان لە دانیشتوان دەکرد ٠

بەم جۆرە هەر جوتیارێکی گوندە ڕزگارکراوەکان لە کێڵگەکـان ئیشیان دەکردو چەکیشیان بەشانەوە بوو ، وە هەموو توانایـەکیـان بۆ زیادکردنی بەرهەم تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی شەڕی ڕزگـاری · ئەم جوتیارانە بە پاڵپشتی سوپای نیزامیو بەهێزی بەرگـری ناوخۆیی دەژمێردران ·

لەماوەی شۆڕش دا توانرا کێڵگەی هەرەوەزی لەلادێ ڕزگارکراوەکان بچەسپێنن بۆ زیادکردنی هاوکاری نێوان هاووڵاتیان بۆ بەرزکردنەوەی بەرهەمبەمەبەستی بەکارهێنانی لە خزمەتی شەڕی ڕزگاری ·

**فێرکردنو ژیانی ڕۆشنبیری**

هەروەك زانیمان کە ژیانی ئابووری لە ڤێتنامی خواروو شلـۆق بووو ، بەڵام فێرکردنو ژیانی ڕۆشنبیری تووشی مەیینو دواکەوتن ببوو لەساڵی ١٩٦٥ـ١٩٦٧ ژمارەی ئەوانەی لە قوتابخانە سەرەتاییەکـان ناونووس کران گەیشتە ٤٧٥ر١ ٠٠٠ر منداڵ ، ئەم ژمارەیەش کەمترە لـە نیوەی ژمارەی ئەو منداڵانەی گەیشتبوونە تەمەنی خوێندن · بەڵامژمارەی ناو نووسراوە قوتابخانە ناوەندییەکان لەو ساڵەدا ٢٦٦ر٠٠٠ قوتابـی بوو · لە بارەی خوێندنی زانکۆشەوە چوار زانکۆ لە ڤێتنـام دا هەبوو کە ژمارەی قوتابییەکانی گەیشتبووە ٢٦٨٧٠ قوتابی وە ژمارەی قوتابیان لە قوتابخانەکانی فێر کردنی پیشەیـی (مدارس التعليـم المهني) ٤٠٠٠ قوتابی بوو، کە ئەمەش بایەخ نەدانی حکوومەت دەگەیەنێت بە دەرچوونی قوتابی پسپۆر بۆ کارکردن لە مەیدانە جیاوازەکانی ئابووری ووڵات ·

دوای هاتنی سوپای ئەمریکا ئینگلیزیشلە شان بەشانی زمانی فەرەنسی چووە مەیدانی فێرکردنەوە ، وە زمانی نشتمانیش جێگەیەکی زۆر نزمی هەبوو لە مەیدانی فێر کردن لە ڤێتنامی باشووری ٠

لەبارەی ئەدەبو هونەریشەوە هێچ پاشماوەیەکی ئەدەبیو هونەری بەدەستەوە نیە کە لە ناوچە ژێر دەستەکانی حکوومەتی سایگۆنی بەکرێ گیراو پەیدابووبێ ٠

هونەری میلییش خۆی لە ئاوەندی ئەو ژیانەدا وون کردبوو کە سەربازە بێگانەکان تیادەژیان تەنها ئەو هەڵپەرکێو سەمایانە دەنوێنرا کە ئەمریکاییەکان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان ٠

وە بە پێویست دەزانرێ کە وێنەیەك لە وێنەکانی ژیان لە ڤێتنامی خواروو پیشان بدرێ ، ئەویش بەهۆی ئەم ژمارانەی خوارەوە کە پێك هاتووی کۆمەڵایەتی دانیشتوی سایگۆنی پایتەخت دەردەخات :ــ

( لەژێر سایەی داگیرکەری سەربازی ئەمریکا ژمارەی دانیشتوانی سایگۆن گەیشتبووە ١¾ ملیۆن کەس کە ٧٠ هەزاری ئافرەتی بێ رەووشت بوون ، ٤٠ هەزار منداڵو ئافرەتی سواڵکەر بوون ، ١٦٠ هەزار لەرێ لادەرو تاوانبار بوون ، ٣٠٠ هەزار بێکار ، ٥٠٠ هەزار منداڵ لە تەمەنی خوێندن بوونو بێئەوەی شوێنێکیان لە قوتابخانەکاندا هەبێت ) ٠

بەڵام ژیان لە ناوچە رزگارکراوەکان روون نیە بەهۆی نەبوونی زانیاری تەواو لە بارەی ناوچەکەوە ٠ بەڵام ژیانی فێرکردن لە ناوچە

ڕزگارکراوەکاندا هەروەك لە یەکێك لە گۆڤارە ڤێتنامییەکانــدا روون کرابووەوە بەم جۆرە بوو :ــ

( لە کۆتایی سالی ١٩٦٤ دا لە ناوچە ڕزگارکــراوەکـــان ٤١٤٢ قوتابخانە هەبوو کە نیو ملیۆن قوتابی دەگرتە خۆی ، بەلام ئــــــەم قوتابخانانە وەك ئەوانە نەبوون کە لە شوێنانی تردا بلاوون ٠ڕێــژەی ئەوانەی خۆیان گەیاندبووە قوتابخانە سەرەتاییەکان گەیشتبووە ٨٠٪ی ئەوانەی گەیشتبوونە تەمەنی خوێندن ) ٠

وە بۆ ئامادەکردنی مامۆستایانی سەرەتایی ، بەرەی ڕزگاریخواز هەلسا بە ئامادەکردنــی مامۆستای قۆناغــی سەرەتایـــی ، وە مەشق پێکردنیان لە کاتی پشووی هاویندا ٠ لە هەر مەلبەندێکا قوتابخانەیەك هەبوو بۆ ئامادەکردنی مامۆستایان کە پێچەوانەی مەلبەندە کاتییەکان بــــوون ٠

بەڕێوەبردنی مەرکەزی بەرەی ڕزگاریخواز سێ پەیمانگای بنیات نا بۆ دەرچوونی پزیشك ، کە هەریەکەیان سەر بەمەلبەندێك بــــوون بۆ دەرچوونی برینپێچ و یاریدەدەری تەندروستی (معاون صحي) بـــۆ خزمەتی لادێکان(٢٣) ٠

---

(٢٣) بریندار لە ناوچە ڕزگارکراوەکان تیماردەکرا ، ئەم ناوچانـــــە لە کۆتایی سالی ١٩٦٤ یانزە نەخۆشخانەی تێدابوو کە لە لایــەن پزیشکی لێهــاتووەوە سەرپەرشتی لێ دەکــرا ، ئافرەتانیشـــــ بەشێوەیەکی سەرەکی خزمەتیان دەکرد ٠
لەهەندێ حالەتدا وەك سووتانی منال بەناپالم یان نەخۆشی شێواو لەرێگەی خاچی سووری رزگارییەوە بۆ هانۆی یان ئەلمانیـــــــای رۆژهەلات دەنێردرا ٠ لە بارەی داوودەرمانیشەوە لە سێ ڕێگــەوە دەستدەکـــەوت :
١ ئەو برەی وولاتانی پێشکەوتووخوازی جیهان بۆ بەرەیان دەنارد ٠
٢ ئەو برەی بەهۆی شەڕەوە دەستیان دەکەوت ٠
٣ ئەو برەی لە ڕێگەی کڕین بەشێوەیەکی ناشەرعی دەستیـــــان دەکــــەوت ٠

## پـاشکـــــۆ

لەگەڵ چۆنیەتی وەرگرتنی مافی‌ن سەربەخۆیی

لەگەڵ چۆنیەتی وەرگرتنی مافی سەربەخۆیی

پاشان یەکگرتنەوەی لەگەڵ ڤیێتنامی باکـــــوور ٠

هەروەها چەند بابەتێکی تریش لەم پاشکۆیەدا دەخوێنیتەوە ٠

نوویستی .
فەرهـاد هـەمزە محەمەد

## بارو دۆخی پێش دامەزراندنی بەرەی ڕزگاری خـواز

دوابە دوای ڕێکەوتننامەکەی جنێف بەشی باکووری ڤێتنـام ئازاد بوو و بەشی باشووریش خۆی لەنێو چنگی داگیر کەرێکی تردا بینییەوە کە ئەویش ئیمپریالیزمی ئەمریکایە ٠

لە کاتێکا گەلی ڤێتنامی باکوور قۆڵیان لێ هەڵکردبوو بۆ بەهێزکردنی سۆشیالیستیو بنیاتنانی کۆمەڵ ، گەلی ڤێتنامی باشوور لەژێر سێبەری حوکمی بەکرێگیراودا ڕووبەڕووی خراپترین بارودۆخ لە مێژووودا بووەوە زۆرداری ، دەرەبەگایەتی ، دەسەلاتی بیروقراتی ، فەرامۆش کردنــــــی کاروباری دەوڵەت ، خۆ خەریك کردن بە ناکۆکی لە سەر حوکم ، کودەتای یەك لە دوای یەك ، ئـەم ، هەموو هــۆیانە ڕێگـــەی بەگــەل نەدا تا باری ژیانی چاك بکات ، وە نەیهێشت حکومەتێکی نیشتمانــــی دڵسۆز بێتە سەر حوکــم ٠

حکومەتی (دیم) هەموو جۆرە ڕێگەیەکی سەرکوت کردنی سەربەستی گرتەبەر بەتایبەتی لە لادێکان کە جوتیاران مەترسییەکی گەورە بوونو هەڕەشەیان لە حکومەتی بەکرێگیراو دەکرد چونکە خاوەن زەوییەکـــان دووبارە ڕێگەی پێشوویان گرتەوە بەر بۆ چەوساندنەوەی جوتیـــاران ، بیروقراتییەکانی چینی ماندارینی کۆن دووبارە دەستیان دایەوە زۆرداری کردن ٠ لە بەرامبەر ئەم هەموو خراپەکارییەشداگەل ڕاپەڕیو لە ڕووی داگیرکەراندا وەك شێر وەستا ٠

هەرچەندە کاری بەرگری لەنێو ڕێکخراوێکی دیاری کراودا لــــە ساڵی ١٩٦٠وە سەری هەڵدا ، بەلام لە پێش ئەم ماوەیەدا واتە لەنێوان

سالی ١٩٥٤ـ١٩٦٠ بەرگری کردنو کوشتنی پیاوخراپان هەر لـــە ئارادابوو و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەشەی دەسەند • ڕێبازی بەرگـــری لەو کاتەدا بریتی بوو لە کارکردن بۆ پاككردنەوەی زەوی وزارەکـــان لە ملكدارو مووچەخۆرە رەسمی یەکان ئەویش بەکوشتنیان بەشێوەیەکـی بەردەوام • هەروەك لە زمانی نوێنەری بەرەی ڕزگاریخوازەوە بیسترا کە دەیووت (ئامانجمان لە کاری کوشتن پـاك کردنەوەیە لە دەسەڵاتـــی دەرەبەگو دەستکێشانی بیروقراتی یەکان بەسەر زەوی و زاردا کـــە خزمەتی بەرژەوەندی دەرەبەگەکان دەکات) •

بێگومان ئەم کردەوەیەی شۆرشگێڕان کاردانەوەی حکومـەتیشی دروست ئەکات ، ئەوەبوو لە سەرەتادا هەڵسا بە بەکرێگرتنی چەنـــد کەسانێك بۆ ئازاردانو کوشتنی شۆرشگێڕان ، یەکێك لەو کەسانـــە (شۆ Chao) بوو (زۆردارێك بوو لە چەشنی زۆردارەکانی سەدەکانـی ناوند ، حەزی بە ئازاردانی بەندی یەکانی دەکرد پێش ئەوەی بیان کوژێت) کە سەرۆکی پۆلیسی نهێنی بوو • ئەم بەکرێ گیـراوە لە ڕۆژی ١٨ی ئازاری ١٩٦٠ بەدەستی چەند چەکدارێك بەسزای خۆی گەیشت • پاش کوشتنی لاشەکەی لەناو شەقامێکدا فرێ درا کە ناونیشانو هۆی کوشتنی لەگەڵدا بەجێ هێڵدرا •

دوابەدوای کوشتنی ئەم زۆردارە سندوقێکی لەماڵدا دۆزراوەتەوە کە ٤٣٢ تاکە گوێچکەی مرۆڤی تێدابوو ، وە هەر گوێچکەیەکیان پارچـــــە کاغەزێك بەناوی کوژراوەکەو پێنج سەد قەرشی پێوە نووسێنرابـــوو ، بێگومان ئەمە بەڵگەی کوشتنی ئەوەندە کەسە دەکەیەنیت • هەروەهـا لە نووسینگە (مکتب) کەیدا ناوی سەدان تێکۆشەری لابوو کە نیـــازی کوشتنیانی هەبوو لەگەڵ ناوی بەکرێگیراوەکانی •

له سالی ۱۹٥۹ دا حکومەت یاسای ژمارە ۱۰/٥۹ ی دەرکـــــرد یاسایەکی فاشیستانە بوو ، هەڕەشەی مردن یا بەندکردن بە درێژایـر تەمەنی لەو کەسانە دەکرد کە نیـازی بەرهەلستی کردنـی رژێمیـــــان هەیە) ، ئەم یاسایە بە پیتی گەورە لە هەموو شوێنێکدا هەلواســـرا • بەهۆی ئەم یاسایەوە پەیوەندی کردنی فیداکاران بەگەلەوە سەختتـر بـــــوو •

## دامەزراندنی بەرەی ڕزگاری خوازی نشتمانیو گەشە سەندنی

لە کاتی بەستنی کۆبوونەوەیەکی گشتی لـــــــە کۆشین چین نە حکومەتو نە سوپای ئەمریکـا نەیان توانـــی پەی بە جێگەکـــە بەرن) لە ۱۰ی کانوونی یەکەمی سالی ۱۹٦۰ دروستبوونی بەرەی رزگاری خوازی نشتمانی ئاشکرا کرا ، کە بە زمانی ڤێتنامی پـێی دەلێن ( مات تران وان توك جیافۆنگ )(۲٤) •

لە رۆژی ۲۰ی کانوونـی یەکەمی سالـــی ۱۹٦۰ ئەم بەرەیـــــە بەرنامەیەکی دە خالی دەرکرد کە ئەمانە برگەکانیەتی :ـ

۱ ـ زالبوون بەسەر رژێمی دەسەلات داری ئەمریکاو ئـەو حکومەتە دیکتاتۆرییانەی ئەم رژێمە یارمەتییان دەدات •

---

(۲٤) بەلام ووشەی (فیتکۆنگ) لە ڕاستیدا دروستکـــــراوی ئەمریکاییەکانە کە بەزمانی ڤێتنامی مانای (کۆمۆنیستەکانـــی ڤێتنام) دەگەیەنێت • ئەم ناوە هیچ پەیوەندییەکی بەناوی ڕاستیو رەسمی ئەو رێکخراوە سیاسییە خەباتگێڕەوە نیە کە لە باشـوور ئالای خەباتی هەلگرتبوو •
ئەو بەرەیەی لە باشوور خەباتی دەکرد بەرەیەك بوو نەك هەر لـــە کۆمۆنیستەکان بەلکو هەموو ڕێبازە سیاسییە تێکۆشەرەکانـــی گرتبووە خۆی •

٢ ـ جێ بەجێ کردنی دیموکراتی راستەقینە ٠

٣ ـ بنیات نانی ئابووری‌یەکی بەهێـزو بەرز گردنەوەی ئاستـــی گوزەرانی دانیشتوان ٠

٤ ـ هێنانەدی چاککردنی کشتوکاڵ وەك نزم‌کردنەوەی کرێی زەوی بەملك کردنی زەوی بۆ ئەو جوتیارانەی دەیکێڵن ٠

٥ ـ هێنانە کایەوەی رژێمێکی فێر کردنو رۆشنبیری نشتمانـــیو دیموکراتی ٠

٦ ـ دروست‌کردنی سوپایەکی بەهێز کە بەرگری لە شارستانیەتی باوو باپیران بکـــات ٠

٧ ـ مسۆگەرکردنی مافی یەکسانی لە نێوان دەستەو تاقمەکانـــی گەل ، وە لە نێوان ئافرەتو پیاویشدا ٠

٨ ـ سیاسەتی دەرەوە لەسەر ئاشتیو بێلایەنی بنیات ئەنرێ

٩ ـ گێرانەوەی پەیوەندی سروشتی نێوان هەردوو بەشی ڤێتنـام وە هەوڵدان بۆ یەكخستنەوەیان ٠

١٠ ـ دژ وەستانی شەڕی دوژمنکـاریو یارمەتـی دانی بزوتنـەوە رزگاری خوازەکان ، وە بەرگری کردن لە ئاشتی جیهان ٠

دوا بەدوای دامەزراندنـی بـەرە ئەندامانـــی ڤیت منە (مەبەست لەوانەیە کە خەلکی باشوور بوون) و هەردوو هۆزی کـاودایو هواهـــاو کەمایەتی‌یەکانی کە مبۆدیاو مۆنتاناو ،لەگەل لاوانی زانکۆو قوتابخانـــە پیشەیی‌یەکانو نوێنەرانی رێکخراوە کشتوکالی‌یەکان چوونە ریزی بەرەوە

لەکۆتایی سالی ١٩٦١ واتە دوای تێپەڕبوونی سالێك بەسەر دامەزراندنی بەرەدا ژمارەی هێزە نیزامی‌یەکانی سەر بە بەرەی ڕزگاری خواز گەیشتە ٢٠ هەزار چەکدار ٠

جەماوەر بە گەورەو بچووکی‌یەوە ، بە ئافرەت وپیاوی‌یەوە بە پەرۆشەوە رووەو شۆڕش دەچوونو لە یەکێك لەریزەکانیدا خەباتیان دەکرد ٠ جگە لە جەماوەر هەلاتن یاخی بوون لەناو سوپادا لەوپەڕی کەشەسەندندا بوو ، لێرەدا دوو نموونە دەخەینە بەرچاو :ـ

١ ـ لە تشرینی دووەمی سالی ١٩٦١ ڕاکردن لە سوپا مۆرکی کۆمەلی وەرگرت ، لە چەند شوێنێکدا بەتالیۆنێك بەتەواوی دەچووە ریزەکانی گەلەوە ٠

٢ ـ لە نیسانی سالی ١٩٦٣ لە ناوچەی (بن‌تری) ٥٤٨٣ سەرباز رایان کرد ٠

ئەمریکایی‌یەکانیش دانیان بەم ڕاستی‌یەدا ناو ژمارەی سەربازە هەلاتووەکانیان لە سالی ١٩٦٦ بە ١٣٢ هەزار سەرباز دایە قەلەم بەلام بەرە ئەم ژمارەیەی بە ١٦٠ هەزار خستە روو ٠ ڕۆژنامەی NEWS AND WORLD REPORT لە ٣١ی تەمموزی ١٩٦٧ نووسیبوویی و دەلێت :ـ

( لە کۆتایی ١٩٦٧ دا لە هەر هەزار سەربازێك تەنها ٧٥٠ سەرباز دەمێنێتەوە ) ٠

هەرچەندە هێرشەکانی بەرەی رزگاری‌خواز بەگوورە فراوان ئەبوو ، ناکۆکی‌یەکانی نێوان هێزەکانی ئەمریکی‌و سوپای سایگۆن

بەهێزتر دەبوو • تەنها لە ماوەی هەفتەی یەکەمی هێرشی(تات Tet )ی بەرەی ڕزگاریخواز لە ساڵی ١٩٦٨ (٢٠٠) هەزار سەرباز دیارنەمان ، ١٦٩ مەڵبەند لە یانزە هەرێمدا چۆڵ کرا کە زۆربەیان بەخۆیـــانو چەکەکانیانەوە چوونە ناو بەرەوە • تا بەم جۆرە شۆرش پانو بەریـــن بوو و پێی نایە قۆناغێکی نوێوە • ئەم هێـزە توانـــی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیانی گەورە گەورە لە ڕژێمی بەکرێ گیراو بداو دەست بەســـەر بەشەکانی وولات دا بگرێت ، تا ئەوە بوو لە دواییدا بەرەی ڕزگـــاری خواز توانی دەست بەسەر زیاتر لە ٣/٢ رووبەری ڤێتنامی خـواروودا بگرێت •

## سوپای ئەمریکاو شەڕە ناڕەواکەی

ئەو هێزە نیزامی یەی ئەمریکا ناخنی بوویە ڤێتنامەوە پێکهاتبوو لە ١٠٠٠ فرۆکە بۆ گواستنەوەی سەرباز ١٥٠٠ فرۆکەی هیلیکۆپتـــەر ٢٠٠٠ فرۆکە (نفاثة) ، ٢٠٠٠ موشەکی بۆمبـــا •

ئەم چەکە کوشندانە بە نوێترین ڕێگا کە زانست پێی گەیشتــووە دروست کرابوو • نوێترین جۆری تۆپ هێنرابووە ڤێتنامەوە کە بـــەوە جیادەکرانەوە زۆر بە ووردی نیشانەکانیان دەپێکـن • بـەڵام دەربارەی چەکي سووك ، سەربازەکان جۆرە چەکێکی ئۆتۆماتیکی یان بەدەستەوە بوو کە لە دەقیقەیەکدا ٧٥٠ گوللەی دەتەقاند • تانكو زرێ پۆشەکان بـــە جۆرێك بوون کە دەیانتوانی بە ئاسانی لە دارستانو شاخو گۆماوەکـان هاتووچۆ بکەن • جگە لەمانە سەرکردایەتی ئەمریکی بۆ زیاتر مسۆگەرکردنی سەلامەتی سەربازەکانی لەکاتی شەڕدا ڕێکخستنێکی زۆر سەیری دانابو • بێتەلەکان (لاسلکی) ئەلکترۆنی بوونو بەردەوامو بێپچڕان لەنێوان بنکەو شوێنی شەڕەکان ئیشیان دەکرد • ئەگەر هەر مەفرەزەیەکیان بکەوتایـــە

بۆسەیەکەوە (کمین) ئەوا لەماوەی چەند خولەکێکی کەمدا سوپای تـــر فریای دەکەوت ... هەروەها فڕۆکەی هیلیکۆپتەر بەردەوام چاودێــری بەتالیۆنە سەربازییەکانی دەکرد . لەکاتی شەویشدا ئامێرێکی رووناك کەرەوەی هەبوو کە تاریکی شەوەزەنگی دەشاردەوە .

ئەم هەموو شتە سەر سوورهێنـەرانە جێگـــەی سەرنج و باسی رۆژانەی پیاوانی بەرەی رزگاریخواز بوو . بەردەوام دائەنیشتن و لـــە شتە سەر سوورهێنەرەکانی شەڕ ئەدوان .

یەکێك لە شۆڕشگێڕان کاتێك لەنێو کۆمەڵە دارێکی چڕدا خــۆی حەشار دابوو ، کەتیبەیەکی دەریاوانی ئەمریکی لە ناوچەکەدا بڕیـــاری نیشتەجێ بوونیان دا . سەرۆکەکەیان بە بێتەل (لاسلکـي)لەگــــەڵ سەرکردایەتی قسەی دەکرد ، دوای ئەوە بە پیاوەکانی ڕاگەیانـــــد کە هەواڵێکی خۆشی پێیەو ئێستا هەموو خۆمان دەشۆین . شۆڕشگێڕەکـە بەردەوام سەیری پیاوانی کەتیبەکەی دەکرد ، بینی هەموویان خۆیـــان ڕووت کردەوە ... بەڵام ئەی ئاو؟

لەم شوێنەدا نە ڕووبارێك یا گۆماوێکی لێ نیە چۆن خۆیان دەشۆن پاش تێپەڕبوونی چەند خولەکێك وەڵامی ئەم پرسیارە مەنتیقییە درایەوە ، ئەوە بوو دوو فڕۆکەی هەلیکۆپتەر هاتن ، یەکێکیان لەبەرزی چەنـــد مەترێك زۆر کەفاوی سابوونی بۆنداری بەسەریاندا ڕژاند ، ئیتر ئـــەم هەلیکۆپتەرە کشایەوەو هەلیکۆپتەری دووەم جێگەی گرتەوە ، وە دەستی کرد بە ڕژاندنی ئاوی پاك بەسەریاندا .

سەرەڕای ئەم سوپا بێشومارە ئەمریکا نەیتوانی هیچ سەرکەوتنێك بە دەست بهێنێ . هەموو کاتێك ڕای گشتی ئەمریکا پرسیاریان ئەکـرد

ئایا چ سرپێکە وای لەو هێزە زۆرەی ئەمریکا کردووە کە نەتوانێت بەسەر ئەو گەلەدا زاڵ بێت ؟ . کاربەدەستانی واشنتۆن هەر خۆیان وەڵامێکی ووشکیان بۆ ئەو پرسیارە داتەناو دەیانووت : ئێمە تەنها بەرهەڵستی بەرەی باشوور ناکەین ، بەڵکو هەموو رۆژێك ڕووبەرووی بەتالیۆنێکی تەواوی سوپای نیزامی کۆماری ڤێتنامی باکوور دەبینەوە کە لە هەندێك ناوچەوە خۆیان دەئاخنیە باشوورەوە ، لەبەر ئەوە بۆ ئەوەی شەڕ لە باشوور بەرینەوە پێویستە لە باکوور بدەین . ئا لەو کاتەوە دەست بە بۆردومانی شارو گوندەکانی ڤێتنامی باکوور کرا ،

فرۆکەکانی ئەمریکا بەردەوام دەوروبەری هانۆی پایتەختیان دەکوتا وە هەڕەشەی بۆردومان کردنی ناو شارەکەو بەندەری هایفۆنگی دەکرد ئەگەر ڤێتنامی باکوور ئاشتی قبووڵ نەکات . جگە لەمە زۆر جار ووڵاتە یەکگرتووەکان بەڕای گشتی جیهانیان دەووت : سەیر بکەن ! ئەوە نیە کۆمۆنیستەکان بەچەك یارمەتی یاخی بووانی باشوور دەدەن بۆ جێ بەجێ کردنی پلانە دوژمنکاریو فراوانکاریەکانیان ! ئائێستا باوەڕ دەکەن کە باکوور سەرچاوەی هەموو ئاژاوەیەکە . لە بەر ئەوە بوونمان لێرەدا شتێکی پێویستە . بەڵام هانۆی بەردەوام بیانووەکانی ئەمریکای ڕەت دەکردەوەو داوای لە ووڵاتە یەکگرتووەکان دەکرد کە لەگەڵ بەرەی رزگاری خواز لە باشووردا بکەونە گفتوگۆ .

ئەم کارەی ئەمریکا وای لە هەردوو گەلی ڤێتنام کرد کە زیاتر خولیای یەك گرتنەوەی هەردوو ڤێتنام بن چونکە هەردووکیان خاوەنی یەك چارەنووسو دوژمنێکی هاوبەش دەجەنگن .

ئەمریکا لەماوەی بوونیدا لەڤێتنام گەلێك پیلانی سیاسیو سەربازی جۆربەجۆری بۆ گەلی دلێری ڤێتنام داناوە ، یەکێك لەوانە پلانەکەی (ویستمۆدلاند) بوو کە ئامانجەکانی لەم چەند خاڵانەدا کۆدەبێتەوە :ـ

١ ـ بنەبڕ کردنی هێزی ڕزگاری خواز • بەڵام دەبینین هێـــزی ڕزگاری خواز بنەبڕ نەکرا ، تەنانەت ئەمریکایییەکان خۆشیان دانیـــان بەمەدا ناوە کە لەهەموو ئەو جەنگانەی ڕوویداوە نەیان توانیــــــوە کەتیبەیەك بە تەواوی لەناوبەرن ، بەڵکو هێزی گەل بەردەوام لــــــە زۆربووندا بوو • کەواتە ئامانجی یەکەمی بۆ نەچووە سەر ، وە ئەوەی ڕوویدا پێچەوانەی بیرکردنەوەیان بوو زیانێکی زۆر لە هێـــــــزی ئەمریکایییەکان کــــەوت ، وە ئەمریکایییەکان خۆیان یەکەم کـــەس بوون دانیان پیادانــــا •

٢ ـ هێمن کردنەوە (کێش‌کردنی خەڵك بۆ ڕیزەکانیان) •

ئەمریکایییەکان وایان باوەڕ دەکرد کە دەتوانن بە دۆلارەکانیــــان هەموو شتێك بکەن ، خەڵك بکڕن‌و کێشی بکەنە ڕیزەکانیانەوە ، بـــەڵام ئەنجامی ئەمەش لەوەی پێشوو باشتر نەبوو •

٣ ـ یارمەتی دانی حکومەت‌و سوپـــا

مەبەستی ئەمریکا لێرەدا بەرزکردنەوەی ورەی سوپا تێك‌شکاوەکەی بوو بۆ ئەوەی لە لێدانی سوپای ڤێتنامیدا چالاکتر بن • بەڵام هەرچەندە ژمارەی سەربازەکانیان زیادی دەکرد توانای هێرش بردن‌و بەرگـــری کردنیان کەم دەبۆوە •

٤ ـ هەوڵدان بە هەموو هۆکارێك بۆ دابڕاندنی باشوور بــــــە وشکایی‌و دەریایییەوە • بەڵام پیاوەکانی واشنتۆن‌و بەکرێ گیراوەکانیان لە سایگۆن نەیانزانی کە باشوور بە هەر چواردە شارەکەیەوە توانـــای بەڕێوەبردنی خۆی‌و فراوانکردنی سوپای ڕزگاری‌خوازی هەیە • لەبـەر

ئەوە ئەمریكا لەوەدا زۆر بەهەڵە چووبوو كە وویستی باشوور ئابلۆوقــە بدات تاوەكو خۆی بەدەستەوە بدات ٠

٥ ـ بۆردومان كردنی باكوور بۆردومانێكی چڕ تا ناچـار دەبێتو ملی ڕێی كۆنفرانسی ئاشتی دەگرێتە بەر ٠ بەڵام بۆردوومان كردن زیاتر لەپێشوو گەلی ڤێتنامی لەسەر خەبات دژی دوژمنكاری ئەمریكا سوور كرد ئەمریكایی یەكان خەیاڵیان خاو بوو كە بە بۆردوومان كردن گەلی ڤێتنــام ناچار بكەن داوای ئاشتی ژێر دەستەیی بكـــات ٠

لە كاتێكا ئەم سوپا بێشومارە بە نوێترین چەكەوە لەگەڵ ئـــەو بارە تێك ئاڵۆزاوە دەبینرێ لەوانەیە رەشبینی خۆی بەسەر مرۆڤــــدا بسەپێنێو هیوای لێ ببڕێ ، كەچی بە پێچەوانەوە تێكۆشەرانی ڤێتنــام گیانی وورە بەرزی لە ڕوویاندا دەگەشایەوە ٠ ڕۆژێكیان مرۆڤێـــك پرسیارێكی لە نوێنەرانی بەرەی ڕزگاری خواز كرد سەبارەت بە بیـــری بەرە بەرامبەر ئـــەم هەڵوێستە ترسناكەو ئـــــەو سوپا زۆرەی ئەمریكا هێناویەتەڤێتنامی خوارووەوە ، هەروەها دەربـارەی هەڵوێستـی حكوومەتی جۆنسون كە بڕیاری بەردەوامی شەڕی داوە تا كۆتایـــی ٠ نوێنـــەرانی بەرەشـ بەبێ ئـــەوەی هـــەڵبچن ، بە خەندەیەكـــەوەو بەهێمنی وەڵامیان دەدایـــەوە :ـ

( تا سەركەوتن لە تێكۆشان ناوەستین ٠ ئەم شەڕەی بەسەرماننـدا سەپێنراوەدەبێت هەر كۆتایی بێت ، بەسەركەوتن بێ یا بە تێكشكـان ، بەڵام دوژمن دەبێت بزانێت ئەگەر دەیەوێت سەربكـەوێ ئەوا دەبێـت لەسەرەتادا نەتەوەكەمان قەڵاچۆ بكات ٠٠٠ هەر تاكێك لـــە ئێمـــەدا مردن بەباشتر دەزانێت لە ژیانێكی دوور لە ئازادیو سەربەخۆیی ) ٠

زۆر کەس ئەم وەڵام دانەوەیە بە دروشمێك لە دروشمە پروپاگەندەییەکانی بەرە دەزانن • بەڵام ڕووداوەکانی ڕۆژگار ئەم وتانەی زیاتر سەلماند ، بەکردەوە سەلماندیان کە ڕۆڵەی کۆڵنەدان و تێکۆشانن • ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٦٨ باشترین نموونەی وتەکانمانن لەم ساڵەدا ڕۆڵەکانی بەرەی ڕزگاری خواز هێرشێکی بەربڵاو بەجەرگانەیان کردە سەر بنکەکانی ئەمریکا کە سایگۆنی پایتەخت یەکێك بوو لەوانە • لەم شەڕانەدا کە کەمتر لە هەفتەیەکی خایاند زیاتر لە ٢٨ هەزار شۆڕشگێر شەهید بوون ، ئەمە جگە لە ژمارەی بریندار کە لە ژمارە نایەت • تا ئەم کارەساتە جەرگ بڕە نەیتوانی وورەی پۆڵایینی شۆڕشگێڕان دابەزێنێ ، بەڵکو هەر بەردەوام بوون لەسەر خەباتی ڕەوایان تا وولاتیان لە گشت پاشماوەیەکی بێگانە پاك کردەوە •

## چالاکییە سەربازییەکانی بەرەی رزگاری‌خواز

ئەگەر بێتوو چاوێك بەو چالاکییانەدا بخشێنین کە شۆڕشگێڕانی ڤێتنام نواندوویانە دەبینین گەلی ڤێتنام توانیویەتی لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی شەڕدا زیانی کاریگەر لە سوپای داگیرکەر بدات ، دەرسێکی وەهای پێبدات کە هەرگیز لەیادی نەکات •

بێگومان ئەو حاڵەتەی ڤێتنام تیای بوو لە مێژوودا بەگەورەترین هێرشی سەربازی دادەنرێ ، وە ڕووبەڕووی مەزنترین خۆڕاگری و نەبەردی بوو • زۆر شتێکی سەرسوورهێنەرە کە گەلێك بەدەستی خاڵییەوە بتوانێت گەورەترین سوپا لە جیهاندا بشکێنێ •

لێرەدا خشتەیەك دەخەینە ڕوو کە سەرجەمی زیانی گیانی هەردوولا لەماوەی هەشت ساڵدا دەردەخات :ـ

١ ـ خشتەی ئەو کردەوە دژوارییانەی (اعمال العنف) کەبەرەی ڕزگاری خواز لەماوەی ساڵی ١٩٥٧ ـ ١٩٦٥ پێی هەڵساوە .

| ساڵ | ژمارەی تەواوی رووداوەکان | هێرشە سەربازییەکان | چالاکییەکانی ڕفاندن | چالاکییەکانی کوشتن |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٧ ـ ١٩٦٠ | نەزانراوە | زۆرکەمە | ٢٠٠٠ | ١٧٠٠ |
| ١٩٦١ | ٥٠٠ | نەزانراوە | نەزانراوە | ١٣٠٠ |
| ١٩٦٢ | ١٩٠٠٠ | ١٣٠٠٠ | ٩٠٠٠ | ١٧٠٠ |
| ١٩٦٣ | ١٩٥٠٠ | ١٥٠٠٠ | ٧٢٠٠ | ٢٠٠٠ |
| ١٩٦٤ | ٢٥٥٠٠ | ١٥٥٠٠ | ١٥٠٠ | ٥٠٠ |
| ١٩٦٥ | ٢٦٥٠٠ | ١٥٥٠٠ | ١٧٠٠ | ٣٠٠ |

٢ ـ خشتەی ئەو زیانانەی لەماوەی هەردوو ساڵی ١٩٦٤ و ١٩٦٥ بە سوپای ڤێتنامی خواروو کەوتووە ـ:

| ساڵ | کوژراو | بریندار | بزربوو |
|---|---|---|---|
| ١٩٦٤ | ٧٠٦٤ | ١٦٧٠٠ | ٥٨٧٤ |
| ١٩٦٥ | ١١٣٣٣ | ٢٢٦٦٠ | ٧٨٨٠ |

لە ٢٩ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ رادیۆی رزگاری خـــوازی راپۆرتێکی لەبارەی چالاکی یەکانی بەرە بەدرێژایی ساڵی ١٩٦٣ لـــە ناوچەی نامیۆی رۆژهەڵات بلاوکردەوە :ـ

( هێزەکانمان لە یانزە مانگی یەکەمدا هێرشی گەورەو بچووکــی خۆیان لەناوچەی نامیۆی رۆژهەڵات دەستپێکرد ، کـە ١٠٦٨٥ کـــەس لەدوژمن پێکراون ، تیایاندا ٦٨ راوێژکاری ئەمریکی کوژران ، وە دەشیان برینداربوون (٣٥) فـرۆکــەمان خستۆتە خـــوارەوەو ٦٣ی تریشمـان پەکخستووە ٥٨ ئۆتۆمبیلی ووشکاوەکـی لـە شێوەی ئێـــم ١١٣و ئێـم ١١٨ ، ١٥ شۆفـەل ، ٢١ (شاحنــة)و ٩ بەلەممان تێــکوپێـکدا ٨١ بنکەی سەربازیمان وێرانکـــرد ٠٠٠٠ دەستمان بەسـەر ١٠٣٦ تفەنگو ٧٤٠٠٠ گوللەو ٨٨٠ بۆمباو ٨١٠ لوغم گرت ٠٠٠٠ بەڵام دوژمن لەساڵی ١٩٦٣ هەڵسا بە ٧٠ هەزار چالاکی پاکسازی گەورەو بچـــووك ، ١٢٠٠٠ کەس کوژراون ، ٨١٠٠ بریندار بوون ، ٥٢٥٠٠ کەس بەندکران ، ٥٧٠٠٠ ماڵ سووتان ) ٠ لەتشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٦ گۆڤارێکـــی فەرەنسی گفتوگۆیەکـی دوورو درێژی لەگـەڵ هۆشی‌منەدا کـــــرد ٠ رۆژنامەنووسەکە زۆر پرسیـاری ئاراستەی هۆشی‌منە کرد کـە لـــە یەکێکیاندا داوای ئەنجامی شەڕی نێوان گەلی ڤێتنامو ئەمریکای لێ‌کـرد

هۆشی‌منه لەوەلاًمدا ڕای‌گەیاند کە هێزی چەکداری ئەمریکـــاو هاوپەیمانەکانی لەنێوان ساڵی ١٩٦٥ ــ ١٩٦٦ دژ(١١)هەزار کوشتارو برینداریان داوه بەبێ ئـەوەی بتوانـن جڵـەوی سارکەوتـن لەدەست هێزەکانمان بکەنەوە ٠

بەڵام دەربارەی بۆردومانی فرۆکەکان ڕایگەیاند، کە فرۆکە کانـــی ئەمریکا بەردەوام هێرش دەهێنێتە سەر ڤێتنامی باکـــوورو ناوچـــە ڕزگارکراوەکانی ڤێتنامی باشوور ،وە ڕۆڵەکانی گەل تا ئێستا (واتە ساڵی ١٩٦٦) توانیویانە ١٣٥٠ فرۆکەی دوژمن بخەنە خوارەوە کە ئەمەشـــی دەرسێکە بۆ ئەمریکا کە هەرگیز لەیادی نەکات(٢٥) ٠

---

(٢٥) وەنەبێت گەلی ڤێتنام بە کوشتنی سەربازی ئەمریکایی خۆش حاڵ بووبێ ، بەڵکو لە زۆر کاتدا دەری‌بڕیوە کە کوشتنیان ناچاری‌یـــە هەروەك هۆشی‌منه لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنووسیدا ڕایگەیاند :ــ
( لێرەدا شتێك هەیە لەوەیە باوەڕی پێ نەکەن ، ئەویش ئەوەیـــە کە تەنها ئەو کاتە هەست بەئازار ناکەم کە گیانی ڤێتنامی‌یـــەك دەرئەچێت ، بەڵکو کاتێ سەربازە ئەمریکایی‌یەکا نیش دەکوژرێـت هەر هەمان شتە چونکە دڵم پێیان دەسووتێ) ٠
هەروەها لە ڕۆژی ٢٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٦دا هۆشی‌منـــە نامەیەکی بۆ گەلی ئەمریکی نارد ، ئەمەش چەند بڕگەیەکێتی :ــ
( بەبۆنەی نزیك بوونەوەی ساڵی نوێوە لە قووڵایی دڵمەوە ئاشتی‌و شادی بۆ گەلی ئەمریکی دەخوازم ) ٠
( پێویست بوو هەردوو گـەلی ئەمریکی‌و ڤێتنامی لـە ئاشتـــی‌و هاوڕێتی‌یەدا بژین ، بەڵام حکومەتی یەکگرتووەکان ٤٠٠ هەزار سەربازو هەزاران فرۆکەو سەدان کەشتی جەنگی بۆ پەلاماردانـی خاکی ڤێتنام ناردووە ، شەوو ڕۆژ بۆمبای ناپاڵم‌و گازی ژەهراوی‌و هەموو جۆرە چەکێکی نوێ بۆ بنەبڕکـــردنی نەتەوەکـــەمان بەکاردەهێنێ ، بێ ئەوەی بەزەیی بەپیرو منداڵدا بێ لادێ‌و شارەکانی سووتان‌و وێرانکرد ، تاوانی وای کردووە لە تاوانکاریدا قەدەغەیە ، فرۆکە ئەمریکایی‌یەکان بۆمباکانیان دەهاوێژنە ناو هانـــــۆی

کاتێك بمانەوێت نموونەیەك لە سەرکەوتنە مەزنەکانی بەرەی رزگاریخواز بخەینە ڕوو ئەوا سەرکەوتنەکانی ٣٠ ـ ٣١ی تشرینی دووەمی ١٩٦٨ باشترین نموونەن ٠

لەم ماوەیەدا هێزەکانی بەرەی رزگاریخواز لەبەرەیەکدا بە درێژایی هەزار کیلۆمەتر هێرشێکی بەربلاویان کردە سەر ١٤٠ شار ٠ لەم هێرشەدا بەرەی رزگاریخواز خاوەنی هیچ هۆکارێکی پەیوەندی کردن یا

پایتەختی خۆشەویست ) ٠
( لە ئەنجامی ئەو شەڕە تاوانکاری‌یەی وولاتە یەکگرتووەکان هەلیانگیرساندووە سەدان هەزار لاوی ئەمریکی کراون بە سەربازو دوور نیشتمان بۆ مەیدانەکانی کوشتاری ڤێتنام نێرراون ، بێهوودە دەفەوتێنرێت ٠
لە سەدان هەزار خێزانی ئەمریکی‌دا باوك کوڕی لەدەست کراوەتەوە ، ئافرەتیش مێردەکەی ) ٠
( لەگەل ئەمەشدا وولاتە یەکگرتووەکان داوای گێرانی ووتووێژی ئاشتی دەکات ، کە ئەمەش تەقەلایەکە بۆ خەلەتاندنی گەلی ئەمریکاو هەمو گەلانی جیهان ، کەچی رۆژ بەرۆژیش ڕووبەڕووی شەڕی فراوانتر دەبێ ) ٠
ئایا کێ ئەم هەموو ڕەشپۆشی‌یەی تووشی هەردوو گەلی ڤێتنامو ئەمریکا کرد ؟ بێگومان فەرمانڕەواکانی ئەمریکا ٠ گەلی ئەمریکاش دەرکی بەم ڕاستی‌یە کردووەو ژمارەی ئەو ئەمریکایی‌یانەش ڕوو زیادبوونە کە داوای ڕێزگرتنی دەستوورو شەرەفی وولاتە یەکگرتووەکانو وەستاندنی دوژمنکاری لەسەر ڤێتنام دەکەن ، وە داوای گەڕانەوەی هەموو سەربازە ئەمریکایی‌یەکان بۆ وولاتی خۆیان دەکەن ) ٠
لە کۆتاییدا هۆشی‌منە ووتی :
(سلاوێکی گەرم لە خەباتتان دەکەم ، سوپاسی لایەنگیری خەباتی نیشتمانیتان بۆ گەلی ڤێتنام دەکەم ، وە دلسۆزانە داوا ئەکەم کە گەلی ئەمریکا سەرکەوتنی گەورە لە خەبات لە پێناوی ئاشتیو دیموکراتیو شادی تۆماربکات) ٠

گواستنەوەی نویێ نەبوو ، ئازووقە لەسەر پشتی پیاوان دەگوێزرایەوە ٠ لە بەرامبەر ئەمەشدا دوژمن نوێترین ئامرازی سەربازی بەکاردەهێنـــا ، لە پشکنینو گەڕاندا خاوەنی ئامێری ئەلکترۆنی بوو ٠

لەگرنگترین ئەو نیشانانەی (اهداف) لەم هێرشەدا پێکـرا بریتــی بوو لە بارەگای گشتی چـوار ناوچـەی سەربازی سەر بە هێزەکانـــی سایگـۆن ، بارەگـای گشتی هـەشت تیپ لە سەرجـــەمی پانزە تیپ ، بارەگایەکی گشتی تر کە پانزە لیوای گرتبووە خۆی ، وە دوو بارەگـای تری سەر بە سوپای ئەمریکی (تایبــەت بەلادێکان بـــوو) ٠ سەرەڕای ئەمانەی باسمان کردن هێرش برایە سەر هەژدە نیشانەی سەرەکی تـــر لە ناوجەرگەی سایگۆندا کە ئەمانە دەگرێتەوە :

بالیۆزخانەی ئەمریکی ، سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکانی ئەمریکیو سایگۆنی ، بارەگای دەریاوانی ڤیێتنامی خواروو ، ئێستگـەی سایگۆن کە ئەمیان بەتەواوی خاپوور کرا ٠ لەلایەکی ترەوە هێرش برایە سەر ٣٠ فرۆکە خانە ، لە نێو ئەمانەدا پانزە بنکەی ئاسمان کە لــــە نێو چوارده بنکە کانی ڤیێتنامی خواروو بەگرنگترین دائەنرا ٠ بەپـــێی بەیاننامەکانی بەرە لەم هێرشەدا ١٥٠٠ فرۆکە تێك شکێنرا ( ئــــــەم ژمارەیە لە واقعەوە نزیکە چونکە دوا بە دوای ئەم هێرشە جـــــــوولەی فرۆکەکانی ئەمریکا بەسەر ئاسمانی ڤیێتنامی خوارووەوە کـــەم بۆوە ٠ هەروەك سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی بەرە لەو ماوەیەدا ووتی : ( ئـــەوا چەند ساڵێکی دوورە بۆ یەکەم جار ڤیێتنامی خواروو لە نەڕەی فرۆکەکان حەسایەوە ، سەربازەکانمان دەتوانن لەگشت ڕێگـــــەوبانە زەمینـــیو ئاوییەکان هاتوچۆ بکەن بێ ئەوەی نەڕەی فرۆکەکان جاڕسیان بکات )٠

هێرشەکەی ساڵی ١٩٦٨ بەتەواوی سەلماندی کە سەرەڕای بەردەوامی بۆردومانەکی ئەمریکا بۆ ماوەی سێ ساڵ ، وە سەرەڕای قەبەیی ژمارەی سەربازو بڕی چەکی بەکارهێنراو لە دژی بەرەی رزگاریخواز کەچی کارگێڕی سەر بە هۆشیمنە لە باکوورو کارگێری هۆن لۆ ( سەرۆکی بەرەی رزگاریخوازی نشتمانی بوو) لە باشوور لە بەهێزترین کارگێرییەکان مانەوە ٠

## رۆلی ئافرەت

ئافرەتانیش شان بەشانی مێردەکانیان یان براکانیان دەچوونە کۆڕی خەباتەوە ، شەڕیان دەکردو چەکیان هەڵدەگرت ، لە بزوتنەوەکانی خەباتو کۆبوونەوکانی خۆپیشاندانو بەرەنگاری بوونەوەی دوژمن دەوری دەبینی ، کاری قورسیان پێ دەسپێردراو بەوپەڕی جوامێرییەوە بەجێیان دەگەیاند ٠

ئافرەتانی ڤێتنام خاوەن هاوبەندی (رابطة) یەك بوون بەناوی هاوبەندی ئافرەتان کە لە ٨ی ئازاری ١٩٦١ دامەزرا وە ئەو ئافرەتانەی وەردەگرت کە مەرجە دیاری کراوەکانی تێدابێ و تەمەنی لە شانزە ساڵ تێپەر بووبێ ٠

ئافرەتان هەروەك پیاوان لەلایەن رژێمەوە ئازاردەدران ، لەسێدارە دەدران ، دەکوژران ، بەندئەکران ٠

خاتوو (نغوین ثای تو) کە لە دواییدا بوو بە سەرۆکی هاوبەندییەکە لە راپۆرتێکیا وەسفی باری قوتابیانی کچ دەکات کاتێك کە بەند دەکرێن دەلێت :ـ

( بەهۆی بەشداری کردنیان لە بزوتنەوەکانی خەبات لە پێنــــاو چەك داماڵین ،وە بە هۆی بنیات نانی ژمارەیەکی زۆر لــە قوتابخانەو بەکارهێنانی زمانی ڤێتنامی لە زانکۆکان ۰۰۰۰ دارو دەستەی دیم ــوولاتە یەکگرتووەکان پەنا ئەبەنــە بەر خراپترین جۆری ئازاردان بــــو ئازاردانی کچان وەك هەڵواسینیان ، ئاوساندنی مەمکیان ، بەڕووتــی خستنە بەرهەتاو ، مار هاویشتنە ناو جل‌وبەرگی ژێــرەوە ، بــــەڕۆن چەورکردنیان‌و پاشان سەگ تێ‌بەردانیان ، شووشەو قۆناغە تفەنگــك خستنە ناو ئەندامانی زاووزێیانەوە ، ئەندامانی زاووزێیان بەرکارەبــا ئەدەن ۰۰۰۰ گەلێکی تر ) ۰

ئافرەتێکی ڤێتنامی پاش ئەوەی جەللادەکان لەژێر ئازاردانێکــــی توندا نامەردانە شەهیدی دەکەن ئەم پارچەشیعرە بە خوێنی زامەکانــی لەشی لەسەر دیواری زیندانەکە تۆماردەکات :ــ

من ئافرەتێکی گــــوڵ ڕەنگم

شان بەشانی پیاو دەجەنگم

پشتم لـــــەژێر

باری ڕقی هەردووکمانا ۰۰۰ دەناڵێنێ

بەندیخانە خوێندگامەو

گیراوەکانیش هاورێمن

(شیر منالمەو ۰۰۰(تفەنگیش) مێرد

ئافرەتان هەروەك پیاوان چالاکی بەجەرگانەیان ئەنجــــــام ئەدا ، سەنگەریان بە دوژمن چۆڵ ئەکرد ، هەڵخەڵەتێنراوانیــــــــان

دەهێنایە سەر ڕێگەی ڕاست ، دەستەی چەکداریان دروست ئەکـــرد ٠ هەروەك بـــەرەی رزگـــاریخواز میدالیایـــەکـــی پلـــە دووی شـــەڕی رزگاریخوازی پێشکەش بە ژنە جوتیار (نغوین فان هان) کرد چونکـــــــە لە کاتێکا هێشتا بنکە شۆرشگێری‌یەکانی بەرە لەناو گونــــــــــــــدە ستراتیجی‌یەکان بوو توانی بەوپەڕی نهێنی‌یەوە کۆمەڵێك چەکــــــــــــدار دروست بکات ٠ هەروەها لەبەر ئەوەی بە ٣٠٠ کردەوەی جەنگی هەڵساوە ، وەتوانیویەتی خۆی بگەیەنێتە ریزەکانی دوژمن‌وڕێگا بۆ تۆپەکانی بەرەی رزگاریخواز خۆش‌بکات تا نیشانەکانی بەباشی بپێکی ٠ جگە لەمانـــــە توانی بەسوود وەرگرتن لە ئاژاوەی نێو ریزەکانی دوژمن ، وە بەیارمەتی دانیشتوانی ناوخۆ ٢٠٠ سەربازی سوپای بەکرێگیراو لە بەجێ هێشتی سوپا قایل بکات ٠

## تاوانەکانی ئەمریکا لە ڤیێتنـــــام

پێناسێکی کلاسیکی ماوتسی تۆنگ هەیە دەڵێت :ــ

( پیاوانی پارتیزان هەروەك ماسی وانو ئەو دەریایەی تیا زۆرئەبن گەلە ، وەبەبێ ئەو دەریایە ماسی‌یەکان ناتوانن مەلەبکەن ٠)

لەبەرئەوەی ئامێری جەنگی ئەمریکا توانای کوشتنی ئـــــــــەو ماسی‌یانەی نەبوو وویستی دەریاکە ووشك‌بکات ، هێزە کوشندەکانـــــی جەنگی بەربلاوی لەدژی گشت پیاوو ئافرەتو منالو ئاژەڵێك ڕاگەیانـــد ، لەدژی هەر زیندەوەرێـــك ، لە دژی هەر شتێکـــی ناوچەکانی ژێـــــــر دەسەڵاتی بەرەی رزگاریخواز ٠ چەندەها رەشماڵگەی دروستکـــرد ، بەزۆر پەلی خەڵکی دەگرتو دەیهێنابە ئاوی‌یەوە ٠

بەپێی سیاسەتی ئەمریکی تاقە ڕێگەی دوورکەوتنەوە لە مردنــــی ڕاستەوخۆ قایل بوونە بەژیانی کولەمەرگی ناو ڕەشماڵگەکان ٠

( مردن مــردن مردن ٠٠٠ چاوەڕوانتانە ٠٠٠ ئایا گوێتـــــــــان لەفڕۆکەکان نابێت ، گوێتان لە تۆپەکان نابێت ؟ ئەوەیــە مــــــــردن مردنتانە ٠ تاقە ڕێگەیەك بۆ ژیان هەیە : ڕەشماڵگەکانتان بگــۆڕن) ٠ ئەمە ئەو قسانە بوو کە ئەمریکاییەکان دەیان کــرد ، لەبەرامبــــــەر ئەمەشدا وێنەی کوشتارو گۆڕو لادێی سوتاوو مردنی ترسنـــــــاكو ئاولکارییان پێ پیشان ئەدان ٠ هەرکەسێك نەچوایە ناوچەکانی ژێــر چاودێری سایگۆنو ڕایبکردایە بە تاوانبار دەژمێردرا ٠ هەرکەسێــــك لەکاتی بۆردومانی تۆپەکانو بۆردومانی ئاسمانی کــەلەپێش هاتنــــــە زووڕەوەیان بۆلادێکان ڕەچاویان دەکرد خۆی لە پەناگەکان بشاردایەوە ئەوا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بەلایەنگری فیتکــۆنگ دەدرایە قەڵــــەمو لەشوێنی خۆیدا دەیانکوشت ، ملکــدارێتی پەناگەیان بەبەڵگــــــەی تاوانبارێتی دادەنــــــا ٠

لەڕەشماڵگــەی بلۆلــۆ ( Bluloi ) دا قەسابخــانەیەکــی زۆر بەئازاری تیا گێڕاو هەزار کەس بەتووەمەتی (فیتکۆنگ) کوژران ٠

ئەمریکاییەکان گشت هۆکارێکیان بۆ خاپوورکردنی گوندەکــان بەکارهێنا ، کە بەبۆمبا دەستی پێکردو بەمووشەك کۆتایی دەهــــــات ٠

ناوچەی (کۆشی) یەکێکە لــەو ناوچانەی هــەرێمی (جیادینـــــــە) پێكدێنێت ، مەڵبەندی ناوچەکە تەنهــا ٣٨کــم لەسایگــۆنەوە دوورە ٠ ئەمریکاییەکان هەموو لادێکانی ئەم ناوچەیە کە بەزەل پەرژین کرابوو خاپوور کرد ، هیــچ خانــوو و دارو گامێشێکــی بەپێــــوە نەهێشت ،

مەرەزەکانی سووتان · پێش هاتنی ئەمریکایییەکان لە ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٦ بۆ ناوچەکە ٦٠ هەزار کەس دانیشتوانی شەش گوندی ناوچەکە بوون · دوای دە رۆژ کاولکاریو خاپوورکردن واتە لە مانگی دواییدا ئەمریکایییەکان بێ شەرمانە ڕایانگەیاند کە ١٨٠ هەزار تۆپ بەناوچەی (کۆشی)یەوە نراوە ، ئەمە جگە لەو فرۆکانەی کە بەرەنگاری بچووکترین جووڵە لە ناوچەکەدا دەبوونەوە بەرەنگاری کیایەك کە هەوا دەیجووڵاند ، بەرەنگاری مریشکێك کە لە کولانەکەی دەهاتە دەر ، یا گامێشێك کە لە زەلکاوێکی بچووك هاتووچۆی دەکرد ·

لەئەنجامی ئەم تۆپ بارانو کاولکارییەدا دەیان هەزار کەس دەربەدەرو ئاوارەی وولاتانی دەوروبەر بوون · هەرێمی (سوای ڕیانگ) لە کەمبۆدیا یەکێك بوو لە مەڵبەندی پەنابەران کە ٢٨٠١ پەنابەری تێدابوو ، لەوانە ٣٥٨ پیاو و ٩٨٠ ئافرەت ، پاشماوەکەشی منداڵ بوو · هەموو ئەمانە لە ترسی هێرشی دڕندانەی ئەمریکایییەکان لادێکانی خۆیانیان کە لەگەڵ کەمبۆدیا هاوسنوورە بەجێ هێشتبوو چیرۆکو بەسەرهاتی هەموو پەنابەرەکان لەیەك دەچوو ·

( دیان فان یای) جوتیارێکی پیرەمێردەو خەڵکی گوندی (تان ئان)ەو لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا بوو ووتی :ـ

( ئەمریکایییەکان بەفرۆکەو کۆپتەرەکانیانەوە هاتن ، تەقەیان لەگشت شتێك دەکرد ، لەپیاوو ئاژەڵو کولانەکان ، هەر کاتێك یەکێکیان ببینیایە قسەی بۆ نەئەکردن یەکسەر دەیانکوشت ، هەموو گامێشو بەرازو مریشکێکیان کوشت ، لادێکەیان بەتەواوی سووتان ، ئنجا بە کۆپتەرەکانیانەوە گەڕانەوە ، پاشان چەند فرۆکەیەك هاتنو

گیراوەیەکی (محلول) ژەردر شینیان بەسەر بەرووبوومەکاندا پرژانـــــە هەموو شتێك ووشکی کرد ، دوابەدوای ئەمە توانیمان ڕابکەینـــــــە ناو دارستانەکانەوە ، پاشان لە ئاومان دا تا گەیشتینە کەمبۆدیا ) .

ئافرەتێکیش بەناوی (لام تی فۆ) کە دانیشتووی گوندی (هۆنگـك دیین) بوو ووتی : ( مێردەکەم لە کێلگەکانی مەرەزەدا بوو گرتیـــان ، لێیان پرسی کوانێ کوڕەکانت ، ئایا لای فیتکۆنگن ؟. وەلامی دایـــەوە کە جگە لە کچێکی پانزە سالی بەولاوە هیچی تر شك نابەم کە ئەویشـ لەگەڵمایە . نیزەیەکیان لە سنگی چەقاند تا هەنـاوی هاتـە دەرەوە ، هەندێکی تریان کچەکەیان گرتو لەبارەی جێگەو شوێنی فیتکۆنگـەوە پرسیاریان لێ‌کرد ، ئەویش بەوە وەلامی دانەوە کە نازانێت ، ئەوەبوو ئەمیشیان بە هەمان ڕێگـــا کوشت) .

(لێ‌یۆنگ) لە هەمان گوندەوە ووتی : (بەکۆپتەرەکانیان دابەزیـن تفەنگەکانیان تەقەی دەکرد ، مێردەکەشم لەتەختاییەکدا بوو . لـــە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بوو تەقەیان لێ‌کردو کەوتە ئاوەوە ، چەنـــــد پیاوێك بۆ فریاکەوتنی چوون ، بەلام هەموو ئەمانەشیان کوشت)

## ووتووێـــژی پاریس

ئەو زیانە گەورەیەی شۆرشگێرانی ڤێتنام بە سوپای داگیرکەری ئەمریکایان گەیاند ، هەروەها ئاکاری ئەو وێرانکارییەی گەلی ڤێتنـــام بەهۆی بۆردومانی نامرۆڤانەی فرۆکەکانی ئەمریکاوە تووشی بــوو ، وە سووتاندنی دەیان گوند ، شەهیدکردنی سەدان وبگرە هەزاران مرۆڤـــی بێ تاوان ، کوشتنی منال و ئافرەت و پەککەوتەو گەلێك شتی تـــــری دوور لە مرۆڤایەتی سەرنجی ڕای جیهان و گەلی ئەمریکای ڕاکیشت .

ئەمریکا دەنگی خستە پاڵ دەنگی گەلانی ترەوە بۆ داواکردن بۆ وەستاندنی بۆردوومانی ڤێتنامی باکوور ، وە وەستاندنی ئەو شەرە ناڕەوایەی لە ناوچە رزگارکراوەکانی بەرەی رزگاری خوازدا بەڕێوە دەبرێ • هەموو ئەم دەنگانە گوێی ئەمریکای کەڕکردو ناچاری کرد بچێتە ووتووێژی ئاشتییەوە •

ووتووێژی یەکەمی پاریس لە ساڵی ١٩٦٨ لە کۆتایی حوکمی جۆنسون دەستی پێکرد • لەم ووتووێژەدا هەرسێ لایەنە ڤێتنامییەکان ئامادەی بوون : حکومەتی ڤێتنامی دیموکرات ، نوێنەرانی بەرەی رزگاری خوازی ڤێتنامی باشوور ، حکومەتی ڤێتنامی بەکرێ گیراو کە لە سەرەتادا هەوڵی دوورخستنەوەی نوێنەرە ڕاستەقینەکانی گەلی دا لەبەرەی رزگاری خواز ، بەڵام ئەم هەوڵانە بەرامبەر وورەی پۆڵایینی گەل چۆکی دادا •

لە ٢٢ی ئازاری ساڵی ١٩٦٥ حکومەتی ڤێتنامی باکوور بەیاننامەیەکی بەناوبانگی لە چوار خاڵدا دەرکرد کە بە بناغەی چارەسەری سیاسی شەڕی ڤێتنام دەژمێردرێ • ئەمەش پوختەکەیەتی :

١ ــ دانانان بە مافی نیشتمانی گەلی ڤێتنام لە ئاشتیو سەربەخۆییو یەکێتی • وە کشانەوەی ئەمریکا لە ڤێتنامی خواروو ، لەگەل دەست نەخستنە کاروباری ناوخۆی ، هەروەها راوەستاندنی چالاکییە جەنگییەکانی دژ بە ڤێتنامی باکوور •

٢ ــ رێزگرتنی بەندەکانی ڕێکەوتننامەی جنێڤی ساڵی ١٩٥٤ •

٣ ــ دەبێت گیروگرفتی ڤێتنامی خواروو گەلی ڤێتنام خۆی چارەسەری بکات بێئەوەی بێگانە دەستی تێ وەردات •

٤ ـ مەسەلەی یەکگرتنەوەی هەردوو ڤێتنام دەبێت گەلی ڤێتنــــام خۆی چارەسەی بکات بێ ئەوەی بێگانە دەست بخاتە ناوی‌یەوە ٠

گفتوگۆکانی ئاشتی پاریس بەچەند قۆناغێکی پەرش‌و بــــلاو دەڕۆی بەڕێوە ، بەجۆرێك کە گەیشتن بــە چــارەسەری تــــەواو زۆر دووربوو چونکە ئەمریکا داوای چەك داماڵینی شۆڕشگێرانی دەکـــرد بەلام ئەم داواکاری‌یە لەلایەن شۆڕشگێرانەوە قبووڵ نەکرا تا ســوپای ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لەناو خاکی ڤێتنامدا بن ٠ هەروەها ئەمریکــا داوای کشانەوەی هەردوو لای سوپای بێگانەی دەکرد (کەهێزەکانـــی ڤێتنامی باکووریش دەگرێتەوە) ، بەلام بەلای ڤێتنامی‌یەکانەوە هێـــزی بێگانە تەنها ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیەتی ، وە سەیری مەسەلــــــەی کشانەوەی هێزەکانی ڤێتنامی دیموکراتیان وەکو مەسەلەیەك کە لـــــە نێوان لایەنە ڤێتنامی‌یەکان چارەسەر دەکرێ دەکــرد ٠ هەروەهــــــا شۆڕشگێران داواکەی ئەمریکایان بۆ دانانی چاودێری‌کەری دەوڵەتـــی ڕەت کردەوەو بە داوایەکی ناماقۆوڵیان لەقەڵــەم دا ، چونکـــە لێرەدا دوژمنکاری ئەمریکا لەسەر خاکیان دەبینرێ ، وە دەبێ چاودێری‌کردنی دەوڵەتی لەســـەر کشــانــەوەی هێزی دەست درێژکــەر دابنـــرێ ٠ شۆرشکێڕانی ڤێتنام دەیانزانی کە چارەسەری ئاشتی تەنهــا بەدەست ئەمریکاوەیە ، وەسوورن لەسەر ئەوەی کە کشانەوەی ئەمریکــا تاقــــە ڕێگەی ئەم ئاشتی‌یەیە ، وە هەموو ئەو وێران‌کاری‌و زیانەی گەلی ڤێتنام نووشی بووە دەخرێتە ئەستۆی ئەمریکا ، هەروەها ئەگەر بێتـــــــوو هێزی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بەتەواوی نەکشێنەوە بەردەوام دەبـــن لەسەر شەڕی ڕزگاری تا سەرکەوتن ٠

لە ۷ی نیسانی ۱۹٦۹ (تیۆ) پرۆژە تایبەتی‌یەکەی خــۆی سەبارەت بە ئاشتی لە شەش خاڵدا پێشکەش کرد کە بریتی‌یــە لە کشــانەوەی

هێزەکانی ئەمریکا بەبێ هیچ مەرجێك ، حکومەتێکی کاتی ئیئتلافی حوکمی ڤێتنامی خوارووبگرێتە ئەستۆ بۆ بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنی نوێ ، بەڵام مەسەلەی کشانەوەی هێزەکانی ڤێتنامی دیموکرات مەسەلەیەکـــــە لەنێوان لایەنە ڤێتنامی‌یەکان خۆیان چارەســەری دەکەن ، دانانــــی چاودێری‌کەرێکی دەولەتی کە چاودێری کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکــاو هاوپەیمانەکانی بکـــــات •

بۆ بەرپەچ دانەوەی پرۆژەی شۆرشگێران ، لە ١٤ی ئایاری هەمان ساڵ نیکسۆنی سەرۆکی ئەمریکا بەرنامەیەکی هەشت خاڵی بۆ چارەسەری ئاشتی لە ڤێتنام پێشنیار کرد(٢٦) • ئەم پرۆژەیــە بریتی‌یە لــــــە کشانەوەی هێزە بێگانەکان لە ڤێتنــامی خــوارووی لەماوەی ســـاڵێکدا

---

(٢٦) دەبێ بزانین کە هەموو هەوڵدانەکانی ئەمریکا بۆ ئاشتی دوورە لە ڕاستی‌یەوە ، وە بۆ خەڵەتاندنی ڕای گشتی جیهانەیە •
لەمانگی ئاداری ساڵی ١٩٦٧ سەرۆکی ئەمریکای پێشــوو (لیندۆن جۆنسۆن) نامەیەکی بۆ سەرۆکی ڤێتنامی (هۆشی‌منە) نارد ، کـــە ئەمەش چەند برگەیەکی گرنگی نامەکەیە
( بۆت ئەنووسم و بەو هیوایەی بتوانرێ سنوورێك بۆ کـوشتاری ڤێتنام دابنرێ ئەو کوشتارەی کە بووە هۆی زیانێکی زۆری ماڵی‌و گیانی ، وە ئەگەر نــەتوانیــن بگەین بـــە رێکەوتنێکــی ئاشتــی ئەوا حوکمی مێژوو لەسەرمان قورس دەبێت) •
(وا باوەڕدەکەم کە هەریەکەمان ئەرکێکی گەورەی لەسەرە بــــۆ کۆشش‌کردن بۆ هێنانەدی ڕێگەیەك کە ئاشتی پێ بەجـــــــێ بگەیەنرێ ) •
( لێرەدا تاقە ڕێگەیەك هەیە بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم گیروگرفتانەو گەیشتن بەئاشتی ، بەنیسبەت ئێمە گفتۆگۆی ڕاستەوخۆ لەنێــوان نوێنەرە باوەڕپێکراوەکانی هەردوولا بەباشترین ڕێگا دەزانیــــن ، بەمەرجێ ئەم گفتۆگۆیە دووربێ لەتیشکی پروپاگەنــدە ، وە نابێت ئەم گفتوگۆیانە بەکاربهێنرێ وەکو هۆکارێك (وسيلة) بــــۆ پروپاگەندەکردن بەڵکو دەبێ هەوڵدانەکانمان زۆر ڕاستەقینـــــە بێت بۆ گەیشتن بە چارەسەری‌یەك کە هەردوولا قبووڵی بکەین )

، وەستاندنی شەڕیش لە ژێر چاودێری دەوڵەتان دەکرێ کە هەڵبژاردنێکی ئازادو دادپەروەرانەی بەدوادا دێت • لە ٨ی حوزەیرانی ١٩٦٩ نیکسۆنی سەرۆکی ئەمریکا بڕیاری کشانەوەی ٢٥ هەزار سەربازی ئەمریکی لەماوەی مانگێکدا لە ڤێتنامی خواروو دەرکرد ، وە دواکاتی ئەم کشانەوەیە کۆتایی مانگی ئابە • لەم بڕیارەی نیکسۆن با فێڵێکی ڕوونی ئەمریکا دەژمێردرێ چونکە ژمارەی ئەو سەربازانەی لەڤێتنام کشاوەتەوە ناگاتە ١/٢ی ژمارەی ئەو سەربازانەی لە ڤێتنامی خواروودا جێگیربوونە کە ژمارەیان خۆی لە نیو ملیۆن ئەدات • مەبەستی نیکسۆن لەم بڕیارەدا هێمن کردنەوەی ڕای گشتی ئەمریکا بوو کە دوای گەڕاندنەوەی سەربازەکانیان بۆ نیشتمان دەکرد ، هەروەها بۆ فریودانی ڕای گشتی جیهانی کە لایەنی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا دەگرن ، ئەمەش دەبێتە هۆی هێمن بوونەوەی پاڵەپەستۆی گەلان • ئەوسا کات بۆ ووتووێژکەری ئەمریکی لە گفتوگۆکانی داهاتوودا زیاد دەکات • دوو ڕۆژ پاش بڕیارەکە واتە لە ١٠ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٩ بەرەی ڕزگاری‌خوازی ڤێتنام گۆڕرا بۆ حکومەتێکی کاتیی کۆماری ڤێتنامی خواروو • لە ڕۆژی دواییدا حکومەتێك لە ٢٢ ئەندام دروستکرا بەسەرۆکایەتی (هوین ئان فات)ی شۆڕشگێر کە ئەندامەکانی لەبەرەی دیموکرات خوازو ئاشتی خوازەکانی ڤێتنامی پێك هاتبوو • دامەزراندنی ئەم حکومەتەش لە کۆنفرانسێکی کۆمیتەی ناوەندی‌یەوە هات کە زۆربەی پارتە سیاسی‌و نشتمانی‌و کۆمەڵە ئایینی‌و ڕێکخراوو هێزە چەکدارو چینە جیاوازەکانی گرتبووە خۆی لە پێناوی چەسپاندنی دیموکراتی‌و ئاشتی •

حکوومەتی شۆڕشگێری نوێ ئاشکرای کرد کە هەموو توانایەکی دەخاتە کار بۆ پاککردنەوەی وولات لە دوژمنکاری ئەمریکاو

جێبەجێکردنی ئاشتی نیشتمانی بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ گەلی ڤێتنـــامی خواروو خۆش بکرێ بۆ وەرگرتنی حوکم و بنیات نانی نشتمان لەســەر بناغەی ئازادی و دیموکراتی و بێلایەنی ، وە گەیشتن بە ئامانجی گەورە کە یەکگرتنەوەی هەردوو ڤێتنامە بە ڕێگەی ئاشتی ٠

حکومەتی شۆرشگێری کاتی دەوری خۆی لە سێ خالی سەرەکیدا دیاری کـــرد :ـ

١ ـ بەردەوام بوون لەسەر تێکۆشان بۆ دەرکردنی هێزەکانـــی ئەمریکـــــا ٠

٢ ـ پاککردنەوەی ڤێتنامی خواروو لە حوکمی ناشەرعی کـــــە چەتەکانی (ثیۆ) و (کاوکای)ی بەکرێگیراو خۆیان تیا دەنوێنن ٠

٣ ـ ڕێکخستنی هەلبژاردنێکی ئازاد کە گەل چارەنووسی خـــۆی بە ئیرادەی تەواوی خۆی دیاری بکـــات ٠

پاشان حکومەتی شۆڕش گۆرانی سەر زاری شۆڕشگێرانی بـــە سروودی نشتمانی هەلبژارد ، هەروەها ئالای شۆرشگێرانی کرد بـــە ئالایەکی نەتەوەیی ، ئامانجەکانی شۆڕشی کرد بە دروشم ٠

بەم جۆرە شۆرش یەکەم بەردی بناغەی بۆ بەئەنجام گەیاندنـــی ئامانجەکان و ڕاکێشانی لایەنگیری میللی و بەرهەلستی کردنی ئەمریکـا لەبەردەوام بوون لەسەر یارمەتیدانی حکومەتی بەکرێگیراو دانا ٠ زۆر لە دەولەتانی جیهان دانیان بەم حکومەتەدا نا ٠

دامەزراندنی حکومەتی شۆڕشگێڕان هیوای مانەوەی لەحکومەتی سایگۆنی بەکرێگیراو بڕی کە خۆی بەحکومەتی شەرعی دەدایە قەڵەم ، وە جووڵانەوەی مێژووش لەناوچەکەدا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە دوا چارەنووس بریتی‌یە لە ڕزگاری‌و گەڕاندنەوەی یەکێتی گەل‌و زەوی.

بارو دۆخ بەم شێوەیە ڕۆی بەرێوە تا ساڵی ۱۹۷۱ هات ، لەم کاتەدا هێزەکانی ئەمریکا بەتەواوی شڕببوو و بە ناچاری چارێکی تر چووەوە ناو ووتوویژی ئاشتی‌یەوە . ووتوویژی ئەم جارە لە ساڵی ۱۹۷۱ ـ ۱۹۷۳ی خایاند کە بەمۆرکردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتی کۆتایی هات .

دوای ئاشکراکردنی ڕێکەوتن‌نامەی وەستاندنی شەڕ لە ڤێتنام نیکسۆنی سەرۆکی ئەمریکا ووتی : ئەم ڕێکەوتنە ئاشتی‌یەکی شەرەفمەندانەی بۆ ئەمریکا هێنا . (تیۆ)ش لافی ئەوەی لێ‌ئەدا گوایە ڕێکەوتنەکە سەرکەوتنێکی بۆ ڕژێمەکەی ڕەخساند چونکە بەرەی ڕزگاری خوازو ڤێتنامی دیموکرات ناچارکران ڕێکەوتننامەکە مۆربکەن‌و چیتر هەڕەشە لە ووڵات نەکەن . بەرامبەر ئەمانە هەریەك لە ڤێتنامی دیموکراتی‌و حکومەتی شۆڕشگێری کاتی ڕێکەوتن‌نامەکەیان بەسەرکەوتنێکی گەلی ڤێتنام دائەنا لەدژی ڕژێمی بەکرێگیراوی سایگۆن ، وە لە دژی دوژمنکاری ئەمریکا لەسەر زەوی‌و زاری نیشتمانی.

بەڵام بەووردبوونەوە لە دەقی ڕێکەوتن‌نامەکە درۆو دەلەسەکانی ئەمریکاو سایگۆنمان لە بارەی (ئاشتی شەرەفمەندانە) و (سەرکەوتن) بەسەر بەرەی ڕزگاری‌خواز بۆ دەردەکەوێت هەروەها بەڕوونی ووردبوونەوە سەرکەوتنی ڕووی تێروانینی شۆڕشگێرانەمان لە دارشتنی دەقی ڕێکەوتن‌نامەکەو بەندەکانی بۆ دەردەکەوێت .

دام‌و دەزگــاکانی راگەیاندنــی رۆژئاواو لقەکانی لەهــەر شوێنێــك‌دا دەیان‌وویست وای دەربخەن کە ڕێکەوتــن‌نامەی وەستاندنــی شــــەڕ ڕوالەتی چارەسەری ناوەندە ، کە ئەمەش ڕەنگ‌دانــەوەی حاڵەتــــی ( نەسەرکەوتن‌و نەدۆراندن)ی هەردوولایەنی شەڕکەرە واتــە هەردوولا بەمایەی خۆیان پاشەکشەیان‌کرد · هەروەها دەیان‌وویست وای بهێننــە پێش چاو گەلان کە ڕێکەوتن‌نامەکە بەرهەمی چەند (تنــــازل)ێکــــی جەوهەری هەردوو بەرەی‌وو تــووێژکــەرە لە پاریس ، دوای ئــــەوەی میللەتەکانیان بەردەوامی شەڕ ماندووی کردن ·

ئەوەی لە پرۆژەی وەستاندنی شەڕدا هاتبوو هیچ جیاوازی‌یەکــی لەگەڵ پرۆژەکەی شۆڕشگێڕاندا نەبوو · ئەوەی شایانــی باســـــە ڕێکەوتن‌نامەی وەستاندنی شەڕ هیچ بەندێك یا بڕگەیەکی پرۆژەکــەی نیکسۆن‌و شیۆی نەگرتە خۆی لە تەنها خاڵێك‌دا نەبێت ئەویش بریتی‌یە (لەدانانی چاودێری‌کــەری دەوڵەتـــی لەسەر جێ‌بەجێ‌کــردنی پرۆژەی وەستاندنی شەڕو ئاڵووگۆڕی دیلەکان) کە لەڕاستیدا ئەم خاڵــــــە داواکاری‌یەکی سەرەکی پرۆژەکەی بەرەی ڕزگاری خوازبوو ·

لە پیاچوونەوەی ئەم سێ پرۆژەیەدا ئەم ڕاستیانەمان بــۆ روون ئەبێتــــــەوە :ــ

١ ــ بەرەی ڕزگاری‌خوازو ڤێتنامی دیموکرات توانی‌یان لـــــــە ڕێکەوتن‌نامەی وەستاندنی شەڕدا ڕووی تێڕوانینی خۆیان‌و پرۆژەکەیان بسەپێنن ، کە بەمەش سەرکەوتنێکی بەدەست هێنـــــا ·

٢ ــ بەرەی ڕزگاری‌خــوازی تەنها لــە چــوارچێــوەی پرۆژە ڕاگەیەنراوەکەی خۆیدا ووتووێژی کــرد ، وە لــە ئەنجامیشدا تــەواوی

داواکاری‌یەکانی هاتەدی ( تەنها یەکێك نەبێت) ، وە هەردوو لایەنـــی ئەمریکی‌و سایگۆنی مل‌کەچیان بۆ کردن ٠

٣ ــ هەر قسەو باسێك لەبارەی (سەرکەوتنی شەرەفمەندانــە)و سەرکەوتنی رژێمی ئیۆو ناچاربوونی لایەنی ڤێتنامی بۆ رێکەوتن تەنهـا هەولدانی بێ سوودە بۆ داپۆشینی هەرەس‌هێنانی بەرەی ئیمپریالیزم لەشەڕدا ، وە بۆ پاکانەکردنی نەهاتنەدی داواکاری‌یەکانی ئەمریکـــی‌و سایگۆنی لەدەقی رێکەوتن‌نامەی شەڕ وەستاندن ٠

لەرۆژی ٢٥ی کانوونی دووەمی سالی ١٩٧٣ رۆژنامەی (ئەنتـــــەر ناشیونال هیرالد تریبیۆن) دەقی رێکەوتن‌نامەکەی بلاو کـــــــــردەوە منیش لێرەدا وای بەباش ئەزانم چەند خالێکی گرنگی لێ بخەمە روو :ــ

١ ــ پێویستە لەسەر وولاتە یەکگرتووەکان‌و هەمــوو وولاتـــان رێزی سەربەخۆیی ویەکێتی ڤێتنام بگرن هەروەك چۆن رێکەوتن‌نامـەی جنێفی سالی ١٩٥٤ دانی پیانـــــا ٠

٢ ــ وولاتە یەکگرتووەکان ئیتر رادەوەستێ لە ناردنی هێـــــزی سەربازی بۆ ڤێتنامی باشووری ، وە دەست ناخاتە کاروباری ناوخۆیەوە٠

٣ ــ پێویستە لە ماوەی ٦٠ رۆژی دوای رێکەوتن‌نامەکە هەمـــرو هێزە سەربازی‌یەکانی ئەمریکاو دەولەتە هاوپەیمانەکانی‌و راوێژکـــارە سەربازی کادرە سەربازی‌یەکان لە ڤێتنامی باشووردا بکشێنێتەوە ٠

٤ ــ مەسەلەی هێزە چەکداری‌یەکان لە ڤێتنامی باشووردا بەبـــێ دەست تێوە گلاندنی دەرەوە بەگیـــانـــی دۆستایەتی‌و بەرژەوەنـــــدی نیشتمانی‌یەوە لە نێوان لایەنە ڤێتنامی‌یەکان خۆیان یەك لایی دەکەن ٠

٥ ـ نابێت هیچ رژێمێکی سیاسی لە دەرەوەوە بەسەر ڤێتنامـدا بسەپێنرێ ٠ واتە گەل بەدەستی خۆی پاشەڕۆژی خۆی دیاری دەکات٠

٦ ـ راستەوخۆ دوابەدوای وەستاندنی شەڕ ، پێویستە هـەردوو لایەنەکەی ڤێتنامی خواروو بەگیانی بەرژەوەندی نیشتمانـی‌یەوە دەست بە ووتووێژ بکەن کە لە سێ لایەنی یەکسان پێك هاتبێ ‹حکومەتـــــی شۆرشگێری کاتی قەوارەی بێلایەن ، رژێمی ثیۆ) ٠

٧ ـ بەندی یانزەی رێکەوتن‌نامەکە هەموو کارێکی تۆڵەسەندنەوەو جیاوازی کردن لە دژی ئەو تاکە کەسو رێکخراوانەی کە لەگەڵ هــــەر لایەنێك لە دوو لایەنەکەی ڤێتنامی خوارووی‌دا هاوکاری کردووە قەدەغـە کــــرد ٠

٨ ـ لە هەمان بەندا ئازادی‌یە دیموکراتی‌یەکان دیاری کــــراوە وەك ئازادی چالاکی سیاسی ، ئازادی شەخسی ، ئازادی دەربڕیـن ، ئازادی رۆژنامەگەری ٠

دوای ئەوەی ئەم چەند خاڵە گرنگەی رێکەوتن‌نامەکەی وەستاندنی شەڕمان خستە بەرچاو ، ئەگەر لەگەڵ پرۆژەکەی بـەرە بۆ ئاشتـــــی بەراووردی بکەین ئەوا هیچ جیاوازی‌یەکمان نایەتە بەرچاو ، دیسانەوە ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ کە رێکەوتن‌نامەکە هیچ بەندێك یا خاڵێکـــی پرۆژەکەی ثیۆ یا نیکسۆنی نەگرتە خۆی ٠

لەمەوە بۆمان روون دەبێتەوە کە گەلی ڤێتنام توانی ئیرادەی خۆی بەسەر بەندەکانی رێکەوتن‌نامەکەدا بسەپێنێ‌و گشت هەوڵدانێکـــــی ئەمریکــــا پێشێل بکات ٠

# شەڕی سێ‌هەمی ڤیێتنام

سەرەڕای بەستنی پەیماننامەی وەستاندنی شەڕ لە پاریس ، ئەمریکا بەردەوام بوو لەسەر جێبەجێ کردنە سیاسەتە گلاوەکانی بەرامبەر بەگەلی ڤیێتنام ، هیچ بەندێك یان بڕگەیەکی لێ بەئەنجام نەگەیاند ، ڕێکەوتن‌نامەکەی بە پشوودانێکی سوپاکەی دادەنا ، دەیوویست ئەم ڕێکەوتن‌نامەیە بکات بە هۆکارێك (وسيلة) بۆ فریودانی گەلی ڤیێتنام و هێمن کردنەوەی بارودۆخ • بێ‌ووچان یارمەتی سەربازی بۆ سوپای بەکرێ‌گیراو دەنارد • هێشتا مەرەکەبی ڕێکەوتن‌نامەکەی پاریس ووشك نەببۆوە ٧٠٠ فرۆکەی جۆراو جۆرو ٥٠٠ تۆپو ٤٠٠ تانك و زرێ‌پۆش و ژمارەیەك پاپۆری جەنگی بۆ سوپای ڤیێتنامی خوارو نارد •

لەسالی ١٩٧٣ بەدواوە سوپای بەکرێ‌گیراو ڕیزەکانی خۆی تەواو دەکرد ، ئەوەبوو ٢٤٠ هەزار جاشی بەکرێ گرت ، داوای زیاتر لە ١٢٠ هەزار کەسی کرد بۆ هاتنە ڕیزی سوپاوە • لەئەنجامدا ژمارەی تەواوی سوپای بەکرێ‌گیراو گەیشتە ٧١٠ هەزار چەکدار •

گەلی ڤیێتنامیش وەنەبێت دەستەوئەژنۆ بەرامبەر ئەم کارە وەستابێت ، بەڵکو ئەویش لە جێگەی خۆیەوە وازی لە ڕێکەوتن‌نامەکە هێناو جارێکی تر کەوتنەوە خۆیان ، خەڵکێکی زۆر چەکدار کرا ، سوپایان ڕێکخستەوە ، ڕێگەوبانەکان چاك کرانەوە ، گەلێك کاری تر کرا بۆ خۆ ئامادە کردن بۆ دوا شەڕی ڕزگاری •

سەربازی ئەمانە چاوێك بە جۆرەكانی چەكدا خشێنراو جـوری نوێی تۆپو فرۆكەشكێن هێنرایە ناو سوپای شۆڕشگێڕانەوە ٠

لەمانگی تشرینی یەكەمی ساڵـی ١٩٧٤ مەكتـــەبی سیاســـیو كۆمیتەی عەسكەری سەر بە كۆمیتەی ناوەندی بـــڕە دەركیان بـــــە نزیكبوونەوەی وەرزی پایز كرد ، كە پێویستە ببێت بەسەرەتا بـــۆ دەست پێكردنە كردەوە جەنگی یە نوێیەكان ، وە دانانی پلانی ستراتیجی بۆ كارە سەربازی یەكانیـــــان ٠

ئەوە بوو جارێكی تر شەڕ داگیرسایەوەو بڵێسەی ئاگر ئاسمانـی گرتەوە ٠ لە ماوەیەكی زۆر كورتدا توانرا ٨٥٠ گوند ئازاد بكرێت ٠ نەوەندە بەسەر ئەم مێژووەدا تێپەرنەبوو ، هەواڵی ئەو سەركەوتنـــە گەیشت كە پاش شەڕێكی بیست ڕۆژە هاتەدی ، تیایدا زیاتـر لە ٣ هەزار سەربازی دوژمن كوژرانو بەدیل گیران ، وە دەستبـــەسەر ٣ هەزار پارچە چەكی جیاوازدا گیـــرا ٠

لەماوەی ئەم شەڕانەدا كارگەو فابریقەكانی بەرگری بێ ووچـــان تۆپی قورسو مووشەكی دروستكراو بەدەستی كرێكاری ڤێتنـــــامی بۆ بەرە دەنارد ٠ شۆڕشی زانستی تەكنیكی توانی هەنگاوەكانی خۆی لە شۆڕشی سێ‌هەمدا بەباشی هەڵێنێ ٠

ئەمریكاش بۆ پاراستنی بەرژەوەندی یەكانی خۆی لەناوچــــەكـە پەیتا پەیتا پارەو پرولی بۆ رژێمی بەكرێگیراو دەنارد ٠ لەساڵـــــی

١٩٧٢ ـ ١٩٧٣ واشنتۆن ملیارێكو ٦١٤ ملیۆن دۆلاری بۆ ئەم رژێمـە تەرخان كرد • بەڵام ئەم یارمەتی‌یە هەروا نەمایەوەو رووی لــە كزی كرد ، ئەوەبوو لە ساڵــی ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥ تەنهــا ٧٠٠ ملیۆن دۆلاری پێشكەش بە رژێمی ثیۆ كرد • ثیۆی بەكرێ گیراویش داوای لـــە لە سەربازەكانی دەكرد كە لە ئازووخە بەكارهێنان دا كەم ئابووربـن ، ژمارەی مووشەكو تۆپەكان هەر لە كەمبوونەوەدا بوو • هەر ئــەم هۆیانە وای لە سوپای بەكرێ‌گیراو كرد كە واز لە شەڕی گەورەو فراوان بهێنێ‌و ڕێگای تری شەڕ بگرێتە بــەر •

ئەم سەركەوتنە گەورانە تەرازووی هێــزەكانــی بە تــەواوی تێكدا ، هەر بۆیە لە ٢٥ی ئازاری ١٩٧٥ دا مەكتەبی سیاسی بــەرە كۆنفرانسێكی مێژوویی بەستو تیایدا زۆر دڵنیایانە توانای ســوپای گەلی دەرخست بۆ ڕزگاركردنی تەواوی ڤێتنامی خواروو لە ماوەیەكــی كــورتدا •

لە كاتێكا ئاگری شەڕ زیاتر گەرم ئەبوو شارو گوندو شارۆچكەكانی ڤێتنام یەك لە دوای یەك ئازاد ئەكراو ئاڵای شۆڕشی تیــــا ئەچەقێنــرا ، ئــەو شارانــەی مــاوەی زیاتــر لە ٣٠ ساڵــە بەدەست داگیركەرانەوە ئەناڵێنن •

ئەو ئاڵوگۆڕەی لە تەرازووی هێزە سەربــازی‌یەكانو هەڵوێستــی سیاسی‌دا ڕوویدا بووە هۆی ڕوودانی گەلێك گۆڕان لە ڕووداوەكــان كە بە هیچ جۆرێك لە بەرژەوەندی ئەمریكایی‌یەكاندا نــەبوو • لە ٢ی نیسانی ١٩٧٥دا جێگری سەرۆكی ئەمریكی دۆكفیلەر دانی پیاناو ووتی:ـ

بەجۆرێك كار لەكار ترازاوە كە هیچمان پێناكرێت تا ئەم بارودۆخە بگۆڕیـن) • ئەمریكایـییەكان بـەردەوام لەسـەر سیاسەتـی دژواریو خوێنڕشتن دەڕۆیشتن تاوەكو (واتەرلۆی دووەم) روونەداتەومو جارێكـی تر ئیمپریالیزمی جیهانی ئابرووی نەچێت • ئەمریكاییەكان بۆیان ڕوون بۆوە كە هەرچەندە چەكو ماڵ بنێرن هیچ لە مەسەلەكە ناگۆرێتو تـازە باریان ڕوو لە لێژییە •

سەركردە عەسكەریو سیاسییەكانـی گەل لە نێـو خۆیانـــــدا كۆبوونەوەیان دەبەستو ئەملاو ئەولایان دەكرد تا بتوانن پلانێك دابنەن كە بەو پێیە سایگۆنی پایتەختی پێبگرنو رژێمی بەكرێگیراو دەربەدەر بكەن • ئەوەبوو دوای چەندین كۆبوونەوە زۆر ژیـرانەو ووردبینانـــە پلانێكی سەركەوتوانەیان بۆ ئەم مەبەستە داناو ناویان لێنا ـ هۆشیمنە •

سەرباری نەخشەدانانی هێرشی گشتی بۆ سەر سایگۆن نەخشەش بو راپەڕینی خەلكی شارەكان كێشرا •

دوای هەموو ئەو سەركەوتنانەی سوپای گەل بەسەر هێزی دوژمندا بە دەستی هێنا ، ئەمریكا ترسێكی تەواوی لێ نیشت ، هەر بۆیە لـــە ١٨ی نیسانی ساڵی ١٩٧٥ كارگێڕی فۆرد ـ كیسنجەر فەرمانی بەپەلـــە كێشانەوەی ئەمریكاییەكانی لە سایگۆن دەركرد • بۆ ئەم مەبەستـــە ژمارەیەكی زۆر فرۆكەو پاپۆری تەرخان كـــــرد •

كاتێك سەربازانـی سوپای سایگۆنـی بەكـرێگیراو هەلاتنـــی ئەمریكاییەكانیان بەچاوی خۆیاندەبینی دوا هیوایان لە رزگاربوون بڕاو نەوەتیان لەبەختی خۆیان دەكرد •

لەرۆژی ٢١ی نیسانی ١٩٧٥ لەو کاتەی شۆرشگێران خۆیان بۆ کوشتاری هۆشی‌منە ئامادە ئەکرد ، سەرۆکی ڕژێمی بەکرێگیراو -تیۆ- فرمێسك بەچاویا دەهاتە خوارەوەو بڕیاری وازهێنانی لەسەرۆکایەتی ئاشکرا کــــرد ٠

وولاتە یەکگرتووەکان لە جێگەی تیۆدا بەکرێگیراوێکی تریان بەناوی (هیۆنگ) دانا کە هیچ جیاوازی‌یەکی لەگەڵ تیۆ نەبوو تەنها لەوەدا نەبێت کە یەکەمیان خائینێکی سەربازی بێ ویژدان بوو ، بـەڵام ئەمیـــــان فەرمانبەرێکی خائنی گلاوە ٠ لە ٢٦ی نیسانی ١٩٧٥ تیۆو خێزانەکەی ڕووەو تایوان هەڵاتن دوای ئەوەی ١٦ تەن زێرو زیوو پارەیان لەگــــەڵ خۆیاندا برد ٠ بەکرێگیراوەکانی تریش یەکە یەکە دوای دەکەوتن ٠

کوشتاری هۆشی منە لە ٢٦ی نیسانی ١٩٧٥ لە کاتژمێر پێنجـــی سەر لە ئێوارە دەستی پێ کـــــرد ٠

لە ٢٨ی نیسانی ١٩٧٥ دوا زنجیرەی کۆمیدیای کۆماری سایگۆنـی بەکرێگیراو نیشاندرا ، ئەوبوو (هیۆنگ) یش ناچارکرا کە واز لــە سەرۆکایەتی بهێنێ ، ئـم بـەستەزمانـە تەنهــا هەفتەیـەك لەسەر کورسی ئەرمو شلی حوکم دانیشت ٠ سەرۆکێکی تر هەڵبژێردرا کە ئەمیان تەنها دوو رۆژ لەسەر تەختی خۆ فرۆشتن دانیشت ٠

لە ٢٩ی نیسانی ١٩٧٥ لە کاتژمێر ١٢ی شەو هێزی گەل وەگـو شێری لەکالان دەرهێنراو ئامـادەی دوا هەلمەتـی بـوو ٠ لـەم رۆژەدا سەرۆکی ئەمریکی جیرالد فۆرد فەرمانی دا بە ڕاگوێزانەوەی هـەزار هاووڵاتی ئەمریکی‌و پێنج هەزار بەکرێگیراو لەگەڵ خێزانەکانیــــان

له ڤیێتنامی خواروو ٠ هەر لەم ڕۆژەدا بالیۆزی ئەمریکی بۆ دواجـــــار سایگۆنی بەجێ هێشت ، دوای ئەوەی مێژوویەکی ڕەشی سی ساڵـــــەی پڕ لە خوێن ڕشتن‌و ناپیاوی تۆمارکــــــرد ٠

لەگەڵ هەڵاتنی گزنگی ڕۆژی ٣٠ی نیسان هاواری ڕزگاری لـــــە رادیۆ (دەنگی ڤیێتنام) ەوە بلاوکرایەوە ٠ جەماوەری گەل هەموو بەجارێك ڕژانە ناو شەقامەکانەوەو بەخێرهاتنی شۆڕشگێرانیان دەکرد ٠ شادی‌و خۆشی سەرتاپای سایگۆنی گرتبۆوە ٠

دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ئەم خوێن مژانە تا دوا ســــاتی ژیانیان لە فرت‌وفێلـــی خۆیان ناکـــەون ، ئەوەبـــوو سەرۆکی ڕژێمــــی بەکرێ‌گیراو لە ڕێگەی رادیۆوە رایگەیاند کە داوای وەستاندنی شــــەڕ دەکات تاوەکو بیرێك لە گوێزانەوەی دەسەڵات بکرێت ، هەروەهــــا چەند جارێك نوێنەرەکانی خۆیانیان بۆ لای سەرکردەکانی گەل دەنـــارد بەڵام لە هەموو جارەکاندا تەریق دەکرانەوەو بە مایە پووچی دەگەڕانەوە ٠ تێکۆشەران بەهەموو هەستێکیانەوە هاواریان دەکرد : (هەردەڕۆین تــا دەگەینە دوژمن لەناو ماڵی خۆیدا ، ئەم هەلە هەر هەزار ساڵ جارێـــك هەڵدەکەوێت) ٠

لــــە دوا ڕۆژی شـــەڕدا سەرۆکایەتـــــی هێزی دەریایـــی بۆ دەرەوەی سنوور هەڵات ٠ ، گەل توانی وەزارەتی بەرگری‌و ئێستگە بگرێت لەکاتژمێر ٣٠ر١١ی ڕۆژی ٣٠نیسان ئاڵای شۆڕش لەسەر بینـــــــای (کۆشکی سەربەخۆیی) هەڵکرا ٠ سەرۆکی ڕژێمی بەکرێ‌گیراویشــــ لەڕێگەی رادیۆوە خۆ بەدەستەوەدانی کۆمارە بەکرێ‌گیراوو لەرزۆکەکەی بلاوکردەوە ٠

ئا بەم جۆرە جارێکی‌تر وولات لە ئیمپریالیزم پاك کرایـــــەوە ، شادی خرایە سەر لێوی منداڵە بێ باوکەکان ، دەنگی گـوللەو نـەڕەی تۆپ‌و فڕۆکە دوایی هات ، جارێکی تر خوێن ڕشتن نایەتەوە بوون‌و ئیتر هەتا هەتا گەل لەژێر سێبەری ڤێتنامی سەربەخۆدا بەشادی دەژین ٠

## یەكخستنەوەی هەردوو ڤێتنام

بێگومان ووشەی (یەك خستنەوەی هەردوو بەش) ووشەی سەرزاری هەموو ڤێتنامی‌یەك بوو چ لە باکوور‌و چ لە باشوور چونکـــە هیـــچ جیاوازی‌یەك لە نێوان هەردوو بەشەکەدا بەدی ناکرێ ٠ لەبەر ئــــەوە سەرۆکە سیاسی‌و عەسکەری‌یەکانی هەردوو بەشەکە هەمیشە بــــەم ئاواتەوە بوون ، هەروەك لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنووسی هۆشی‌منـە لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٦دا ڕۆژنامە نووسێکـی فەرەنسی لـێ‌ی پرسی :ــ

ئایا دواڕۆژی ڤێتنـامی سەربەخـــۆ دوای شەڕ (مەبەستی شەوی ڤێتنامی خوارووە لەگەڵ ئەمریکا) چی دەبێت ؟ ٠

هۆشی منە لە وەڵاما ڕایگەیاند :ــ دوای گەڕانەوەی ئاشتی ، گەلی ڤێتنام هەموو هێزو توانای بۆ بنیات‌نانەوەی نشتمان دەخاتە کــــار ، وەگۆڕینی بۆ وولاتێکی یەکگرتوو ، ئاشتی خواز ، بێ‌لایەن دیموکراتی ، پڕ لەشادی ، پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ هەموو گەلانی جیهـــــان ببەستێت ٠

لەشوێنێکی تریشدا لەهەمان چاوپێکەوتندا ووتی :ــ

( تانیشتمانەکەمان یەك نەگرێتەوە ، تا هاووڵاتیان لەباشـــووردا هەموو جۆرە ئازارو ئەشکەنجەیەك بچێژن هیچ خواردنێکم بەدڵـــــــەوە

نانووسێت ، هیچ خەوێکی خۆش ناخەوم ، دەسا ئەی هاووڵاتیان لـــە باشووردا پێتان ڕائەگەیەنم کە ڤێتنامی باشووری خۆشەویست بەهەوڵ‌و کۆششی گەل دەگەڕێتەوە پاڵ نیشتمان ) ٠

بەڵام داخەکەم هۆشی‌منە هاتنەدی ئەو ئاواتەی بەچاوی خـــۆی نەبینی ، بەڵام هەموو کاتێك سووربوو لەسەر ئەوەی کە هەر ئـــــەو ڕۆژە دێت کە هەردوو ڤێتنام دووبارە یەکدەگرنەوە ٠

ئەوەبوو گەل توانی بەهەڵمەتە شێرانەکەی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٥ تەخت‌و تاراجی ڕژێمی بەکرێ‌گیـــراو برووخێنێ‌و ڕژێمێکـــــی سۆشیالیستی لە جێگەی دابنەن کە هاووشانی ڕژێمی ڤێتنامی باکوورە‌و لە هەموو ڕوویەکی ئابووری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌یـــەوە تەواوکـــەری یەکتـــرن ٠

پاش تێ‌پەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەم سەرکەوتنەداو لە ڕۆژی یەك شەممەی ڕێکەوتی ١٩٧٦/٤/٢٥ ملیۆنەها خەڵکی هەردوو بەشـــەکـــەی ڤێتنام دەستیان کرد بە هەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ یەکخستنەوەی هەردوو بەشەکەی ڤێتنام ٠ ڕادیۆی هۆشی‌منە ئەوەی بڵاوکردەوە کــــە هەموو سەرکردەکانی پارتی کرێکاران‌و ئەندامانی حکومەت لە هۆشی‌منە‌و هانۆی دەنگیان بۆ هەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتمانی داوە ، وە ژمــــارەی ئەو کۆمەڵەیە ٤٩٢ کەسە لەوانە ٢٤٩ نوێنەریان لە بەری ڤێتنـــــــامی دیموکراتی‌و ئەوانی تریان لە بەری ڤێتنامی خـــوارووو هەڵدەبژدرێــن :

کۆمەڵەی نیشتمانی توانی ناوێکی نوێ بۆ ڤێتنام دابناو ، پایتەخت‌و ئاڵاو سلاوی کۆماری بۆ ڤێتنام هەڵبژێرێ ٠

لێپرسراوانی هەردوو بەرەی ڤێتنام ئەوەیان ڕاگەیاند کە ئـــــەم هەڵبژاردنە بە سەرکەوتنێکی گەورەی وولآت دادەنرێ ٠

ئا بەم جۆرە گەلی ڤێتنام توانی دوای چەندین سال تێکۆشـــانو هەولدان ، دوای پێش کەش کردنی هەزاران شەهید بەخەلآت بۆ رێی رزگاری ئاواتی دێرینەی گەل بهێنێتە دی ٠

## دیاردەیەك لە ڤێتنامەوە دەزگای جاسووسی ئەمریکای حەپەسانددووە

چەندین دەرس و تاقی کردنەوە هەیە کە ئەمەریکا لەشەڕی ڤێتنام و بەچۆکا هاتنیدا سوودی لێوەرنەگرتوو لێوەیان فێرنەبوو !

دەرسێك لەو دەرسانە ئەوەبوو کە (ئالان دۆسۆن)ی رۆژنامەنووسی ئەمریکایی لەم دوایی‌یەدا ( واتە لە ساڵی ١٩٧٥ ـ ف٠هـ٠م ـ) پەردەی بەسەر لاداو ئاشکرای کرد ٠٠٠ دۆسۆن کە پێنج ساڵی رەبەق لە خوارووی ڤێتنام بەتایبەتی لە سایگۆنەوە هەواڵی بۆ ئەمریکا ناردووە ٠ وە لـەم دوایی‌دا لە ڤێتنام دەرکرا ، لەم بارەیەوە نووسیویەتی دەڵێ :ـ

( تاقی کردنەوەی ڤێتنام سابیتی کردەوە کە دەزگاکانی ئاسایشی شۆرشی ڤێتنام زۆر لە دەزگای (مخابرات)ی ئەمریکایی دەست رۆیشتووتر بوون ٠ رژێمی دوابراوی سایگۆن بەکەسانێك تەنرابوو کە سەر بە بەرەی رزگاری‌خوازی نیشتمانی خوارووی ڤێتنام بوون ٠ بەڵام دەزگاکانی ئەمریکا چ ئەوانەی لەسایگۆندا بوون یان ئەوانەی لە ئەمریکاو دەرەوەدا بوون نەیان توانی دەرك بەمە بەرن ! لە زۆر کەس و زۆر ناوداران لە سایگۆن ئەبیسترا کە کاربەدەستن و دەست رۆیشتوون و بەوەش ناسراون کە (دوژمنی خوێنە خۆی کۆمۆنیستن) کەچی لە دواییدا دەرکەوت کە وانی‌یەو ئەو کەسانە خزمەتی شۆرشی ڤێتنامیان کردووە ٠٠٠٠ وە ئەوەی سەر زارەکی دەری بڕیوەو ئەو کردەوانەی کردوویەتی تەنیا بۆ ئەوەبوو کە ئاشکرا نەبێ و بتوانێ و لەناو جەرگەو ریزی دوژمندا خزمەت بە شۆرش بکات) ٠

---

(٢٧) ئەم باسە لە ژمارە ٢٨٩ی رۆژی ٢٤/١٠/٩٧٥ی رۆژنامەی هاوکاری‌یەوە وەرگیراوە ٠

دۆسۆن لە نووسینێکدا کـە لـە ١٠ی ئەیلوولی ١٩٧٥ لــە (هیرالد تریبیۆن) بلاوی کردۆتەوە دەڵێ :ـ

( یادگارو دیاری‌یەکم لایە کە فەرماندەی پۆلیسی لەشکری ڤێتنام دایمێ ... ئەو فەرماندەیە ماوەیەکی زۆرو چەند ساڵێك لەریزی دەزگای موخابەراتی مەرکەزی سایگۆن ئیشی دەکرد ... کەچی لەدواییدا وەك دەرکەوت سەر بە شۆرشگێرەکان بوو) ٠

ئەو رۆژنامەنووسە دیسانەوە دەڵێ :ـ

( دەزگای ـ سی ـ ئای ـ ئەی ـ ئەمریکا لە هەرێمێکی خوارووی ـ مترجم ـ یکی ڤێتنامی هەبوو ، ئەمریکایی‌یەکانی وا لێکردبوو کە هیچ گومان لەوە نەکەن کە ئەو کابرایە دوژمنی کۆمۆنیستی‌یە ، کــە ئەو هەرێمە دەست شۆرشگێران کەوت ، ئەو ـ مترجم ـ ەش بەدیل گیرا٠ ئەمریکایی‌یەکان گومانیان لەوەدا نەبوو کە لە سێدارە ئەدرێ .... کەچی لەپڕ کابرای ـ مترجم ـ دەرکەوت کە کۆلۆنێلە لەریزی لەشکــری شۆرشگێراندا ، وەکرا بە فەرماندەی عەسکەری ئەو هەرێمە ڕزگارکراوە)

دۆسۆن لەدەم ئەندازیارێکی ئەمەریکاوە بیستوویەتی‌و ئەڵێ :ـ

( لەدەزگایەکی ئەندازیاری ئەمەریکادا لە سایگۆن کارم دەکــرد ، ٢٠ کەسی ڤێتنامیش لەو دەزگایە لەگەڵ مــن دامەزرابــوون و رۆژ نەبوو چاویان بە نەخشە نهێنی‌و راپۆرتی ئەندازیاری بنکەکانــی ئەمریکاو شوێنی تفاق‌و چەك‌و زەخیرە نەکەوێ ، بەڵام دوای ڕزگارکردنی سایگۆن بۆم دەرکەوت کە ئەو بیست کەسە ڤێتنامی‌یە ئێمەیان بەفریــو بردووەو چەند کەسانێکیان سەرکردەی پایەبەرزی شۆرشگێران بوون)٠

ئەم دیاردەیە دەزگای ـ سی ـ ئای ـ ئەی ـ ئەمریکایی حەپەسساندووە هەر لەپڕ لە ئاهەنگێکدا کە ئێستا (واتە ساڵانـی حـەفتا ـف٠هـ٠م)ـ دەگێردرێ ناوی چەند سەرکردەو کەسانێك دەبیستری کە لەمەوبەر (واتە لەکاتی شەڕدا) ئەمریکاو دەزگاکانی یان هەر نەیان بیستوون یاخود گومانی لێ نەکردوون و هی واشیان هەبوو کە لە کۆمەڵگا ئەمریکایی یەکان کاریان کردووە ٠

بەم پێیە شۆرشگێڕو جەنگاوەرانی ڤێتنام لە چەند قۆلێکــەوە جەنگیون تا دوژمنیان بە چۆکا هێنــــا ٠

ئەمە دەرسێکی زۆر گەورەیەو ـ سی ـ ئای ـ ئەی ـ سەرســام کردوە ٠٠٠ بەلاَم هیچ کاتێك ئەم دەزگایە سوود لەو دەرسە وەرناگرێ٠

## جەنگاوەرێکی ڤێتنامی(٢٨)

لێرەدا دەمەوێت یەکێك لەو رۆڵە نەبەردانەی گەلی ڤێتنام بخەمـە روو کە هەتا هەتا جێگەی شانازی و سەربەرزی گەلی ڤێتنامە ، ئەویش (نیۆن فان ترۆی) یــــە ٠

نیۆن فان ترۆی ئەو شۆرشگێرەیە کە هەروەك ڤێتنامی یەکانی تـر چەکی شەرەف و مەردایەتی هەڵگرتبوو ، شان بە شانی گەلە کـــۆڵ نەدەرەکەی لە سەنگەری مەردایەتی یەوە خەباتی دەکرد بۆ وەدەرنانـــی ئیمپریالیزمی خوێنخۆری ئەمریکا کە چەند ساڵێکە دەستی گڵاوی خۆی

(٢٨) جەنگاوەرێکی ڤێتنامی ناونیشانی ئەو کتێبەیە کە کاك محمدی مەلا کەریم لە ساڵی ١٩٧٠ وەرگێراوە ، منیش لێرەدا کورتەکـــەی دەخەمە روو ٠

خستۆتە ناو خاکی ڤێتنامەوەو حوکمێکی بەکرێگیراوی تیا چەسپاندووە کە ئیشی تەنها چەوساندنەوەو راووڕووت کردنی گەلی ڤێتنامە ٠

ئەم جەنگاوەرە لە ساڵی ١٩٦٤ هەڵسا بەکارێکی بەجەرگانـە ، ئەویش بەدانانی لوغمێك لەژێر ئەو پردەی کە بڕیار وابوو لە مانگـی مایسی هەمان ساڵ (مەکنەمارا)ی ئەمریکی بەسەردا بڕوات ٠ بـەڵام ترۆی سەرنەکەوتو گیرا ٠ پاش لێدانو ئەشکەنجەیەکی زۆر فەرمانـی گوللەباران کردنی دەرکـرا ٠

شۆڕشگێرانی فەنزەویللاش لە تۆڵەی ئەم کـارە ناڕەوایـەی ئەمریکایییەکان هەڵسان بە ڕفاندنی کۆلۆنێل (سمۆلێن)ی ئەمریکایـی ، وە هەڕەشەی کوشتنیان لێکرد ئەگەر بێتوو ترۆی بکوژرێ ٠ لەبـەر ئەم هۆیە ئەمریکایییەکان پەیمانی بەردانی ترۆیاندا ٠ هەر کـە فەنزەویلاییەکان سمۆلینیان بەرەڵاکرد ، ئەمریکا لە گفتی خـۆی پەشیمان بـۆوە ٠

لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٤ کاربەدەستانی سایگۆن بـە فەرمانی ئەمریکایییەکان نیۆن فان ترۆیان گوللەباران کرد ٠

سەر لە بەیانی هەمان رۆژ پێش گوللەباران کردنی بەچـەند سەعاتێك کۆمەڵێك رۆژنامە نووسی ڤێتنامیو بێگانە گەیشتنە تەختـانی گوللەباران کردنەکە ، بینییان ، بینییان کوڕە لاوێك هەر چوار پـەلی بەکۆڵەکەیەکەوە بەستراوە ٠ ترۆی گۆنگرەیەکی رۆژنامە نووسی بۆیـان گێڕا کە هەتا هەتا لەپێش چاویان وون نابێت ٠

ترۆی پێی ووتن :ـ

ئێوە رۆژنامەنووسن بێگومان ئەزانن چی روو ئەدات ، ئەمریکـا بە فرۆکەو بۆمبا هاتووەتە سەر وولاتەکەمانو قەسابخانەیەکی بـــــۆ گەلەکەمان سازداوە • ئەم مەکنەمارایەی کە من وویستم بیکوژم دانـەری نەخشەی داگیرکردنی وولاتەکەمانە ، منیش وولاتەکەی خۆمـم لە رادە بەدەر خۆش ئەوێ ، ئەم وویست لێیان بگەرێمو سەربەخۆیی وولاتەکەمان پێشێل بکات • هەرگیز شتێکی وام نەوویستووەو نەم کردووە کـــــە لەگەڵ خواستی گەلەکەمان نەگونجێ ، ئەوەی کردم دژی ئەمریکاییەکان بوو ، ئەمووویست ئەو مەکنەمارایە بکوژم کە هەمـوو ئـەو تاوانانـەی بەرامبەر وولاتەکەم کردووە •

یەکێك لە رۆژنامە نووسەکان لێی پرسی :ـ

ـ پێم بڵێ بەرلەوەی بمریت داخی چیت لەدڵدایە ؟

ـ تەنها داخی یەك شتم لەدڵدایە ، ئەویش ئەوەیە مەکنەمارام بـۆ نەکـــــوژرا •

کاتێك یەکێك لە موغەکان وویستی داوای لێبوردنی بۆ بکـــــات لەخوا ، تووڕە بوو ، ووتـــــی :ـ

ـ هیچ تاوانێکم نەکردووە ، تاوان لای ئەمریکاییەکانە •

ئەوجا چاوپێچەکەی لەسەر چاوی لاداو ووتی :ـ

ـ لێم بگەڕێن با چاوێك بگێرم بە نیشتمانە خۆشەویستەکەمدا • بێ ترسو لەرز مرد ، کە یەکەم ریزی فیشەك سنگی سمی ، هێشتـــــا هەر هاواری دەنگی ئەدایـــەوە :ـ

ـ بژی ڤێتنـــــام ٠

ـ بژی سەرەك هۆشی منـــــە ٠

لەو کاتەوە هەموو گێتی ناوی ئەم خارەمانە لاوە ئەزانێ ٠

شاعیری بەناوبانگ (تۆهۆ) ووتەیەکی بەنرخی بەبۆنەی شەهید بوونی نیون فان ترۆیەوە ووتووە کە دەلێ :ـ

( جۆرە مردنی وا هەیە ئەبێ بەهۆی نەمردنی خاوەنەکەی )

ئەم رۆلە دلێرە بێوەژنێکی گەنجی لەپاش بەجێ ما کــە تـــــازە خواستبووی ناوی ( فان تی کۆیان) بوو ، پاش شەهید بوونی مێردەکەی خۆی گەیاندە ناوچە ئازادکراوەکانی ڤێتنـــــام ٠

هەزار سلاو لەو دایکەی کە رۆلەی وا پێدەگەیەنێت ٠

هەزار سلاو لەو خاکەی کە رۆلەی وا لە ئامێز دەگرێت ٠

## ئەدەبو شۆڕش

بێگومان زۆربەی ئەو چیرۆكو شیعرانەی كە ئەدیبان لەكاتــــی شۆڕشدا ڕێكیان خستبوو هەموو لە ژیانی گەلی ڤێتنام لەكاتی شۆڕشدا ئەدوان چونكە هەروەك هەموو ڕووناكبیران لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون كە ئەدەب ئاوێنەی واقعــــــە ٠

لە چیرۆكنووسە بەناوبانگەكانی ڤێتنام (فان ثای)یە كە یەكێـــك لە چیرۆكە بە ناوبانگەكانی ناوی (تێكۆشانی لادێیەك)ە كە تیایـــــدا ڕووداوەكانی سالآنی ١٩٥٤ ــ ١٩٦٣ی تۆمار كردووە ٠

گەلی ڤێتنام جگە لە چیرۆك نووس ژمارەیەكی زۆر شاعیـــــری مەزنیشی تێدا هەلكەوتووە وەك (تاین ئای) كە لە شیعرێكیدا لەخەباتــی دووەمی گەلی ڤێتنام دەدوێو باسی خەباتگێرێك دەكات كە پێنج ســالە ڕووی لە كۆڕی تێكۆشان كـردووەو نەگەڕاوەتــەوە ، ئــەم شیعــرەش بەناونیشانی (پەڕینەوە لە هێلی سنوور)ە(٢٩) ٠

پەڕینەوە لە هێلی سنوور

دوێنێ شـــەو ،

لەهێلی سنوور پەڕیمەوە ،

بەرەو باكوور ، بۆ دیتنی تـــۆ

چەند ڕۆژێكی پڕ لە تاسەو سۆز

بەناو كێلگەكانی برنجـــا ،

---

(٢٩) ئەم شیعرە لـــە ژمـارە ٤٣ـ٤٤ی گۆڤـاری ڕۆشنبیری نـوێوە بلاوكراوەتەوە ، ئەم شیعرە كاك عبدالله پەشێوی شاعیر كردوویە بەكوردی ٠

بەشەقامی چەندەها شارا

خێرا رۆیشتم .... خێرا

ئای ! ئەوە کێیە ، لە دوورەوە ،

شێوەی لە تۆ ئەکات ؟

ـ ئەوە تۆی ! تۆ ، تۆ ، تۆ !

ـئەوە تۆی !

بەرەو پیریت ڕامکــــرد

قیژانــــــدم :

( ئازیز راوەستە !

ئەوە منم مــــەرۆ )

ـ نــــەء ... نارۆم ،

لەناو سەدەها ... هەزارەها ئافرەتا ،

بەدیمکردیو جیــامکردیتەوە

ڕووی خۆم شاردووەوە ، لەسەر سنگت

دەستم کرد بەگریان ...

دوای پێنج ساڵ دابڕان

توند باسکت ئالاندە ملم

ویستت گەلێك شتم ، بۆ بگێڕیتەوە

لێت پرسیم ،

دەربارەی دێکەمان

چۆن دەکرێت

لەو دەمو دەستە ، هەموو شتێك

باس بکـــــەم ،

دەربارەی ئەو ساڵە تاڵانەی رابووردن ؟

دەستێکت بە قۆڵمدا هێنـــــا
ئەو قۆڵو باسکەی ، جارەهای جـــــار
ساڵانی رابردوو ، سەری خۆت پێدەکرد
کتوپڕ راچڵەکیت
( ئاخ قۆڵت براوە ! )
کێ قۆڵی بڕیویت ؟
من پێنج ساڵە چاوەڕێت دەکـــەم
هێشتا دەستم لێت هەڵنەگرتووە
شووم نەکردۆتەوە

من بەجێم نەهێشتی ،
دوژمن ڕاوی کـــــردم
دوژمن قۆڵی بڕیــم
ئەو قۆڵەی تۆ جاران ، سەری خۆت پێدەکرد

هیچم نەدرکانــــــد
تەنیا گریام ... تاکو ، دڵی خـــۆم ،
رووناکبکـــــەمەوە
لەسنگی تۆشا ... ڕق پریشکی هاویشت
باوەشت پیــــا کردم ،
دەست کرد بە لاواندنەوەم

کەڵەشێر بانگـــــیدا
بەئاگـــا هاتمو حەپەســـــام
ئای ! ئەوە خەوبـــــوو
دڵم خوێنی تاسەو ئازاری لێ ئەتکـــــا

نازیـــزم

ئایا ئاگاداریت

لەخوارووی ئەوپەڕی تاسەوە

هەموو شەوێك ، دڵم ،

لەهێڵی سنوور ڕەت دەبێتو

دێت ... بۆ بینینی تـــۆ ؟!

هەروەها شاعیرێکی تر بەناوی (کوان می) پارچە شیعرێکی سەرکەوتووی هەیە ، وا لێرەدا دەیخەمە روو .

**ـئاخفتنا بچویکەکی ـ(٣٠)**

ئەزێ بویم دا گرتی خانا ببینم

چ قین من چ تە دیتیە ... ژ سێبەرێ

ژنفەنگاو ستریا پێفر

خوێندنا چیچکا نزانم

روناهی یا رۆژێ نزانم ...

ئەز نزانم ...

شەکرك د چاوانن

تۆ دبیێ وەکی سێین گەنی بن؟

ئان وەکی کۆمتێت برنجێ رەقە ..

ئەزن ڤان دەخۆمو

برس من بەرنادەت ..

بۆچـــی ...

(٣٠) ئەم شیعرە لەژمارە ٢٨٦ی ٢٦/١٠/١٩٧٥ی رۆژنامەی هاوکاری‌یەوە وەرگیراوە ، وە لە لایەن شاعیرێکی لاوی کـوردەوە بەنـــاوی (سەرفراز) کراوە بە کوردی .

ڤان دوژمنا نەڤێن ئەز بژیم ..
چنکو ژمن دترسن !!
ئەز هێیشتا بچویکم
چاڤ زەلامم لێڤ سـوورە
دسەر هیندێ را ئەز گرتی‌یەکی سیاسی‌مە
ئەز نزانم سترانا بێژم !!
دسەر هیندێ را ..
ئـەز کوشتم ؟
واو ژەهر کرە ناڤ برنجێ‌و
مـن خـار ..
ئاگر ژ هناڤێن من چـو
من دەنگێ تفەنگـا گولێ بـوو
ئای ... دەیکـا منا شیرین
یا دگـەفزێت ...
سینگێ وێ یێ بێ شیرە
لیڤێن من یێن دسوژن
ئـەی هەڤالێن مـن ...
پەیڤێن من بکولن لهز راخـو
ئەم هزار بچویکین ..
دنالین لناڤ گرتی خانا ( ڤێتناما زووری )
دێ لمـەکەن
هەوارێن مە ناراوەستن
نزانم جیهانا هەوە گولێ هەیە ؟!

شاعیرانی کوردیش بەش بەحاڵی خۆیان هاوبەشی غەمو پەژارەو خۆشی ئەم گەلە بوونەو بەشیعرەکانیان هەستی خۆیانیان بۆ دەرخستوون ئەوەتا شێرکۆ بێکەسی شاعیر لە شیعرێکیـــا دەڵێت :ـ

لە فیتنـــاما ...

شاخێ هەناسەی هەڵکێشاو ،

چەمی شەوێکی هەڵمژی

کاتێ هەناسەی دایەوە ، لەدەمێوە

خۆر سوارێ بوو هاتە دەرێو

لەناو بەیانیی دەروونیی ،

ـ هۆشیمنەـدا ، دابەزیی

## دوو یادگـــاری(٣١)

لەکۆتایی ئەم کتێبەدا حەزم ئەکرد ئەم دوو یادگاری‌یە بناخنمـە ناوی‌یەوە کە جەنەراڵ جیاب دەیگێرێتەوەو ڕووداوەکانی دەگەڕێتـــەوە بو پێش شەڕی ڕزگارکردنی ڤێتنامی باکوور واتە ساڵانی چل :ـ

١ ـ ڕۆژێکیان لە شاخێکی نزیك پایتەختی ناوچەی ( نجان سون ) بووم ، نامەیەکی بەپەلەم لە هەڤاڵ (تۆنگ)ەوە پێ‌گەیشت تیایدا داوای لێ کردم کە بەپەلە بگەرێمەوە بۆ سەرکردایەتی • منیش بەپەلە گەڕامەوە بۆ هەرێمی (کاوبانگ) ـ دوای گەیشتنم بۆ سەرکردایەتـی پێیـــان ڕاگەیاندم کە هۆشی‌منە لەکاتی بەجێ‌هێنانی ئەرکێکدا لەچیندا گیراوە ، وە بەهۆی نەخۆشی‌یەکەوە کە تووشی بووە لە بەندیخانە کۆچی دوایـی کردووە ، هەرگیز چاوەڕوانی گوێ لێبوونی وەهام نەئەکرد ••• لەناکاو سەرم سووری خواردو هەموو شتێـك لەبەرچاوم دەســووڕانـەوە •••• بیرم کردەوە هۆشی‌منە مرد •• ئای چ زیانێك لەگەلی ڤێتنام کەوت •

ئیتر گفتوگۆ دەستی پێ‌کرد دەربارەی ئەو راپۆرتەی دەبوایـــــە کومیتەی ناوەندی بەرزبکرێتەوە ، هەروەهـا بەم بۆنەیـەوە بڕیـــاری ڕێکخستنی ئاهەنگێکمان دا • بڕیاردرا کە هەڤاڵ تۆنگ ووتاری ئـــەم ئاهەنگە بدات ، وە داوامان لە هەڤاڵ (کاب) کرد کە جانتا بەناوبانگـەی هۆشی‌منە ئامادە بکات ، بۆ ئەوەی شتەکانی ناوی وەکو یادگارێـــــك هەلبگرین •

لەدواییدا داوامان لە هەڤاڵ (کاب) کرد کە بچێت بۆ چین بـــۆ دۆزینەوەی ئەو شوێنەی کە سەرۆکی کۆچ کردووی لێ نێژراوە •

---

(٣١) ئەم دوو یادگاری‌یە لەکتێبی ( قصة المقاومة الفيتنامية كما يرويها ابطالها) وەرگیراوە •

دوای چەند رۆژێك سەرلەنوێ هەڵسامەوە بەکارەکانـم • هەستم بە خەمێکی گەورە دەکرد کە دڵی پارچە پارچە دەکرم ، هەستم ئەکـرد بەتەنها لە جیهاندا ئەژیـم •

پاش تێپەڕبوونی چەند رۆژێـك ، رۆژنامەیەکمـان لـە چینـەوە پێگەیشیت کە تیایدا هۆشیمنە سڵاوو تەندروستی خۆی تیا بەیـان کردبوو ، هەروەها پارچە شیعرێکیشی بۆ نووسیبووین • گەیشتینـە پلەیەکی شادی کە هەرگیز وەسف ناکرێ ••• رۆژنامەکەمان بەپەلـە بۆ هەڤاڵ (کاب) برد و پرسیارمان لێکرد :

ـ ئەمە مانای چییە ؟

وەڵامی دایـەوە :

ـ من تێناگەم ••• پارێزگاری کۆفتانگ‌خۆی رایگەیاند کاتێك لـە چین بووم ، کە نجوین ئای کووك (هۆشیمنه) مردووه •
دەیان پرسیارمان لە هەڤاڵ کاب پرسی :

ـ هەوڵبدە بیربکەرەوە کە پارێزگاری کۆفتانگ چی پێ ووتووی ، ئـەو رستەیە چییە کە بەزمانی چینی پێی ڕاگەیاندی ؟

دوای ئەوە بۆمان دەرکەوت کە پارێزگاری چینی بەزمانی چینـی پێی ووتووە ( باشە ••• باشە ) ••• بەڵام هەڤاڵەکەمان بەهـەڵە لەم ووشەیە گەیشتووە ،وای زانیوە دەڵێ :

( مردووە ••• مردووە ) ، چونکە ئەگەر گۆڕانێکی زۆر کەم لـە لەفزی ووشەکە رووبدات ماناکەی دەگۆڕێت •

ئیتر هەموو دامانە قاقای پێکەنین •• لە گەورەترین تەنگـەو چەڵەمە رزگاربووین کە چەند مانگێك بوو ببووە قورسایی سەرشانمان •

٢ ـ رۆژێکیان لەکاتی قسەکردنمدا بۆ خەڵکی لادێیەك لە باسی ئاسایی لامداو چوومە سەر چوار نەسازی ( التناقضات الاربعة ) یەکەی کە باری دەوڵەتانی پێ جیادەکرێتەوە · دوای تەواوبوونی باسەکە هاونیشتمانییەك کە لە ئەندامە بەرزەکان بوو دەستی بەرزکردەوەو داوای قسەکردنی لێکردم · منیش دوای ئەوەی رێم دا ووتی :ـ

ـ داوات لێئەکەم کە رێگەی کشانەوەم لە رێکخراوەکە بدەی ·

ئەی هەڤاڵ بۆچی دەتەوێ بکشێیتەوە ·

ـ من ئامادەم بە هەڵسان بە هەر کارێك کە داوام لێ بکەی ، بەلام ئەبینم وانەکان زۆر قورسن ، وە ناتوانم وەریبگرمو لەبەری بکەم ، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە من گونجاو نیم بۆ ئەم کارە ·

ئەمەم بە دەرسێکی زۆر مەزن دەژمارد کە لە یەکێك لە قوتابیەکانەوە وەرمگرت ··· لەبەر ئەوە کۆششم کرد بۆ ئەوەی پرۆگرامێك دابنەم کە تێگەیشتنی ئاسان بێت ·

## ئەو سەرچاوانەی ئەم پاشکۆیەی لێ پێك هێنراوە


١ ـ كيف انتصر الفيتكونغ في ڤيتنام

٢ ـ قصة المقاومة الفيتنامية كما يرويها ابطالها

٣ ـ جەنگاوەرێکی ڤێتنــــامی

٤ ـ رۆژنامەی هاوکاری ژمارە ٣١٥ و ٢٨٦

٥ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە ٤٣ـ٤٤

٦ ـ الفيتكونغ ـ اساليب تنظيمها ـ

٧ ـ هوشیمنه ـ حياته ـ

٨ ـ الحرب الفيتنامية الثالثة ـ تأليف ـ وان تين زونك ـ

٩ ـ ئافرەت و ژانی لەدایك بوونێکی تر ـ١٩٧٩ـ

١٠ ـ هەروەها لە چەند بڕگەیەکدا سوود لە کتێبە وەرگێڕراوەکـــــە وەرگێـراوە

١١ ـ مجلة كل شيء ـ العدد ١٠٢٥ المصادف ١٥ حزيران ١٩٧٤

## ئـــەم كتێبـــە

* لە مێژووی خەباتی گەلی ڤێتنام دەدوێت ، ئەو [illegible] بە درێژایی چەرخەکانی کۆن و ناوەڕاست و نوێ دژی دەسە[illegible] بێگـانەو دەرەبەگ و بۆرژوا خەباتی کردووەو سەختی ڕێگای تێکۆشـان ساردی نەکردۆتەوە .

* ئەو گەلەی بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤدا ئەفسانەی هێـزی سەربازی ئیمپریالیزمی ئەمریکای شکاند . وە سەلماندی کە هیچ هێزێك بەرامبەر ڕق و کینەی مروڤ خۆی ڕاناگرێ .

* ئەو گەلەی بۆ جاری دووەم لە مێ[illegible] ابرووی ئیمپریالیزمی جیهانی بردو (واتەرلۆی دووەم)ی خولقا[illegible]

* ئەو گەلەی سەلماندی کە بەهار بێ سەرماو سۆڵی زستان نایەت ، سەرکەوتنیش بێ قوربانی دان و خوێن ڕشتن دەستگیر نابێت .

سەرپەرشتی لە چاپ دانـــی

سامی عزیز رسول

نرخی (١) دیناره